پرۆژەی بەهای فەرموودە

قۆناغی ١

# ٢٣٠ فەرموودەی پێغەمبەر

صلى الله عليه وسلم



نووسینی

سیروان کاکە أحمد

بەهای فەرموودە

# ٢٣٠

# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

نووسینی : سیروان کاکه أحمد

دیزاینی ناوەوە و بەرگ : زەردەشت کاوانی

چاپی دووەم ١٤٤١ك- ٢٠٢٠ز

١٤* ٢١ سم ، ١٠٩ لاپەڕە

بابەت : ئایینی

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٦٠٢ ) ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

قۆناغی ١

پڕۆژەی بەهای فەرموودە

# ٢٣٠ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

نووســـینی

ســـیروان کاکە أحمـــد

١٤٤١ك - ٢٠٢٠ز

بسم الله الرحمن الرحيم

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

رَبِّ يَسِّر أعِن، يَا كَرِيم

## پێشەکی

لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پارێزگاری لێکردن و کار پێکردنی لە کردەوە هەرە باش و گرنگەکانە، وە لە بەڕێزترین و گەورەترینی عیبادەتەکانە، جگە لە فەرزەکان، ئەو کەسەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەکات و لە ماناکەی تێدەگات و لە نێو خەڵك بڵاوی دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ غيره»[1].

لەم فەرموودە دووعا کردن هەیە، یان هەواڵدان هەیە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی هەوڵی پاراستن و بڵاو کردنەوەی فەرموودە دەدات.

دیارە تێگەیشتن لە ئایین لە ڕێگەی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتەوە دەبێ، وە تێگەیشتن لە سوننەت لە ڕێی شرۆڤەو شیکردنەوەی زانایان دەبێ، هەر کەس ئەمەی کرد نیشانەی ئەوەیە خوا ویستی خێری بۆی هەیە.

بێگومان لە خزمەت دابوونی قورئان، واتە: لە خزمەتدا بوونی خوای بەرز! چ خۆشحاڵیەکی تێدایە کاتێك بەندە لە خزمەتی پەروەردگاری خۆیەتی و گوێی بۆ گرتوە، وە دەست گرتن و کارکردن بە قورئان، هۆکارە

---

(١) أخرجه أحْمَد: ١٦٧٨٤، وصحّحَهُ شعيب الأرنؤوط.

بۆ بە دەستهێنانی سیفەتە بەرزەکانی قورئان، بۆ وێنە: قورئان مەزنە، هەر کەس دەستی پێوە بگرێ، مەزن دەبێ، قورئان خۆشەویستە هەر کەس دەستی پێوە بگرێ، خۆشەویست دەبێ، قورئان بەخشندەیە، هەر کەس دەستی پێوە بگرێ، بەخشندەو سەخی دەبێ..

دیارە لە خزمەت دابوونی فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، واتە: لە خزمەت دا بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەمان ئەو سیفەتانەت پێ دەبەخشێ کە قورئان بە خاوەنەکەی و هاوەڵەکەی دەبەخشێ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کردارو گوفتارو رەفتارو گشت هەڵسوکەوتەکانی قورئانێکی بەرجەستە کراو بوو کە لەسەر زەوی دەڕۆیشت... پێشم وانیە هیچ کاتێك وەك ئێستا مسوڵمانان ئاوا موحتاجی ئەوە بووبن جارێکی دی بچنەوە قوتابخانەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك قوتابیەك لە خزمەتی لەسەر چۆك دابنیشن و گوێ لە فەرمایشتە موبارەکەکانی رابگرن و لەبەری بکەن و تێبگەن و کاری پێبکەن و خۆیانی پێ برازێننەوە، پاشان خەڵکی لێ فێر بکەن.

ژیان لەگەڵ فەرموودە شیرینەکانی خۆشەویستی خوا ﷺ تام و چێژو لەززەتی تایبەتی خۆی هەیە، ژیانە لەگەڵ بەرێزترین مەخلوق، ژیانە لەگەڵ سەرەتای هاتنی وەحی و نبووەت، ژیانە لەگەڵ جیلێك کە باشترین جیلی سەر زەوی بوون و (خیر القرون) بوون، خوا لە هەموویان رازی بێ، ژیانە لەگەڵ دونیایەکی زۆر جیا لەم دونیا ماددیە وشکە!

## پێگەی سوننەت لە ئیسلامدا

گومان لەوەدا نیە کە ناحەزان و تێنەگەیشتووان لە ئیسلام بە جۆرەها شێوە دێن گومان لەسەر ئیسلام دروست دەکەن و دەیانەوێ بە فووی دەمیان ڕووناکی خۆری ئیسلام بکوژێننەوە، ئەم کارەشیان بەردەوامە، یەکێك لە کارەکانیان بریتیە لە هەوڵدان بۆ ڕەت کردنەوەی سوننەت بە گشتی، وە دەڵێن: قورئان بە تەنیا کافیەو پێویستمان بە حەدیس نیە، مەبەستیش لەم بانگەشە پیسە لە ناوبردنی شەریعەتی ئیسلامە، چونکە دیارە سوننەت چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئانە، بۆیە تانەدان لە سوننەت، تانەدانە لە قورئان، ئا ئەم بانگەشە پووچە لە کۆتایی جیلی زێڕینی هاوەڵان سەری هەڵدا، وردە وردە تەشەنەی کرد تا دواتر گەیشتە ئەم نەوەی ئێستا.

ئیتر بەردەوام زانایان بەرپەرچی گومانەکانیان داونەوە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا، وە ئێمە هەر زۆر بە کورتی ئاماژە بە چەند بەڵگەیەك دەکەین کە گەورەیی و پێگەی سوننەتمان بۆ دەردەخەن، بۆ هەر کەسێك کە خوا ڕێنمایی بکات و خۆشی بە دوای هەقدا بگەڕێ.

دەڵێین: سوننەتی پاکی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانی موعتەبەری لەسەرە کە بە بەڵگە دەهێنرێتەوە، سوننەت هەم وەك چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئان بە بەڵگە دەهێنرێتەوە، هەم وەك خۆی کە بۆ حوکمێکی سەربەخۆ گوتراوە، وە چەندین بەڵگە لە قورئان هەن فەرمان دەکەن بە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺو، شوێنکەوتنی سوننەت، وە بە پێچەوانەوە هەڕەشەو ورياكردنەوەی زۆر هەن بۆ ئەوانەی پێچەوانەی سوننەت هەڵسوکەوت دەکەن، با سەرنجی چەند دەقێك بدەین:

دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴿٣١﴾ ﴾آل عمران، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خوای پەروەردگاریش خۆشتانی دەوێ.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴿٨٠﴾ ﴾النساء، ئا لێرەدا خوای پەروەردگار گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری ﷺ بە گوێڕایەڵی خۆی داناوە.

دوا ئایەت ئەوەیە کە خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونی فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ ﴿٧﴾ ﴾الحشر، واتە: هەر شتێك لە فەرمان کە پێغەمبەر بۆتانی دێنێ و پێتان دەڵێ وەری بگرن و جێبەجێی بکەن، وە کە قەدەغەشتان دەکات لە هەر شتێك، وازی لێ بێنن و ئەنجامی نەدەن.

کە هیچ گومان لەوەدا نیە، ئەم دەقە هەم وەرگرتنی قورئان و هەم وەرگرتنی فەرموودە دەگرێتەوە.

لە ڕاستیدا بەبێ سوننەت هیچ کەسێك ناتوانێ دینداری بکات، ئێمە وەك مسوڵمانان ڕۆژانە پێویستیمان بە فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، تا لە کاروباری ژیانی ڕۆژانەمان بە کاریان بێنین و بە پێی ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەفتار بکەین.

## دەربارەی: لەبەرکردن و گێڕانەوەی فەرمووده

١- {عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «رَحِمَ اللَّهُ مَنْ سَمِعَ مِنِّي حَدِيثًا فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَهُ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى لَهُ مِنْ سَامِعٍ»}[١].

**واتە: ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ کە گوێبیستی فەرموودەیەك دەبێت لە من، وە ڕایدەگەیەنێت بەو شێوەیەی کە بیستوویەتی، چونکە زۆر کەس هەیە کە فەرموودەی پێ ڕادەگەیەنرێت چاکتر لێی تێدەگات لەو کەسەی بە خودی خۆی (لە پێغەمبەرەوە ﷺ) بیستوویەتی.**

٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بە ئەنقەست درۆ بە ناوی منەوە بکات، ئەوە با شوێنێك بۆ خۆی لە نێو ئاگردا ئامادە بکات.**

٣- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً، وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»}[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە منەوە ڕایبگەیەنن و بڵاوی بکەنەوە ئەگەر یەك ئایەتیش بێ، وە لە نەوەی ئیسرائیل (قسە) بگێڕنەوە هیچی تێدانیە (مادام لەگەڵ**

---

(١) أخرجه إبن حبان: ٦٨، وَصَحَّحَهُ الألباني، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

(٢) أخرجه البُخَارِيُّ: ١٠٨.

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ٣٤٦١.

قورئان و فەرمووده تێکنەگیرێ)، وە هەر کەسێك بە ئەنقەست درۆ بە ناوی منەوە بکات، ئەوە با شوێنێك بۆ خۆی لە نێو ئاگردا ئامادە بکات.

## دەربارەی: بانگخوازو بانگەوازی

٤- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِكُلِّ عَمَلٍ شِرَّةٌ، وَلِكُلِّ شِرَّةٍ فَتْرَةٌ، فَمَنْ كَانَتْ فَتْرَتُهُ إِلَى سُنَّتِي، فَقَدْ أَفْلَحَ، وَمَنْ كَانَتْ إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ فَقَدْ هَلَكَ»}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کردەوەیەك (کە مرۆڤ دەیکات سەرەتایەکەی) توندو تۆڵی و چالاکیەکی زۆری تێدایە، وە هەموو توندوتۆڵی و چالاکیەکی زۆریش خاوبوونەوەو ساردبوونەوەکی بەسەردا دێ، جا هەر کەسێك (لەو دینداریەی کە دەیکات) ساردبوونەوەکەی لە سنووری سوننەت ڕاوەستاو (بە پێی سوننەت دینداری کرد) ئەوە سەرفراز بووە، بەڵام ئەگەر لەو سنوورە لایدا ئەوە بە دڵنیایی لەناوچووە.

٥- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ»}[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بیگۆڕێ (و ڕێی لێ بگرێ) بە دەستی، ئەگەر نەیتوانی ئەوە با بە زمانی بیگۆڕێ و ڕێگە نەدات (ئەو خراپە بکرێ)، ئەگەر ئەوەشی نەتوانی، ئەوە با بە دڵ پێی

---

(١) أخرجه أحمد: ٦٩٥٨، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٤٩.

ناخۆش بێ و (دووعا بکات بۆ گۆڕینی ئەو خراپەیە)، ئەوەش (واتە: بە دڵ پێناخۆشبوونەکە) لاوازترین پلەی ئیمانە.

٦- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلاَّ اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْماً، فَإِذَا كَانَ إِثْـماً كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِنَفْسِهِ، إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ تَعَالَى، فَيَنْتَقِمُ لِلهِ عَزَّوَجَلَّ بِهَا»}[١].

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشك نەکراوە لە نێوانی دوو شتاندا حەتمەن کامەی ئاسانە ئەوەی هەڵبژاردوە مادەم گوناح نەبووبێ، وە ئەگەریش گوناح بووبێ، ئەوە لە هەموو خەڵکی لێی دوورتر بووە، وە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی نەسەندۆتەوە، تەنها (کاتێك تۆڵەی سەندۆتەوە) ئەگەر سنوورو حەرامکراوەکانی خوای بەرز بەزێنرابن، ئەو کات تۆڵەی وەرگرتۆتەوە بۆ خوای زاڵی پایەدار.

٧- {عَنْ أَبَا عِنَبَةَ الْخَوْلَانِيَّ رضي الله عنه يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَزَالُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَغْرِسُ فِي هَذَا الدِّينِ بِغَرْسٍ يَسْتَعْمِلُهُمْ فِي طَاعَتِهِ»}[٢].

واتە: ئەبو عینەبەی خەولانی رضي الله عنه دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای زاڵی پایەدار بەردەوام لەم دینەدا نەمامانێك دەچێنێ (واتە: کەسانێك پەروەردە دەکات لەسەر ڕێبازی ڕاستی ئیسلام)، وە لە فەرمانبەریی خۆیدا بەکاریان دێنێ.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٥٦٠، ومسلم: ٧٧.

(٢) أخرجه أحمد: ١٧٨٢، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

٨- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدٍ خَيْرًا اسْتَعْمَلَهُ» قَالُوا: وَكَيْفَ يَسْتَعْمِلُهُ؟ قَالَ: «يُوَفِّقُهُ لِعَمَلٍ صَالِحٍ قَبْلَ مَوْتِهِ»}(١).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خوا چاکەی بۆ بەندەیەکی خۆی بوێ بەکاری دێنێ، (هاوەڵانیش خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن بەکاری دێنێ؟! فەرمووی: یارمەتی دەدات بۆ ئەنجامدانی کردەوەیەکی چاك بەر لە مردن.**

٩- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ»}(٢).

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترینی خەڵکی سوود بەخشترینیانە بۆ خەڵکی.**

١٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى، كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ، كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا»}(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خەڵکی بەرەو هیدایەت بانگ بکات، بە ئەندازەی هەموو ئەوانەی کە شوێنی کەوتوون پاداشتی هەیەو، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوانیش کەم ببێتەوە، وە هەر کەسێك خەڵکی بەرەو گومڕایی بانگ بکات، ئەوە بە ئەندازەی هەموو ئەوانەی شوێنی کەوتوون گوناهی هەیەو، بێ ئەوەی هیچ لە گوناهی ئەوانیش کەم ببێتەوە.**

---

(١) أخرجه أحمد: ١٢٠٣٨، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.
(٢) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ في «الأوسط»: ٥٧٨٧، والقضاعي في مسند الشهاب، وَصَحَّحَهُ الألباني.
(٣) أخرجه مُسْلِمٌ: ٦٩٨٠.

## دەربارەی: پشت بەستن بە خوای تعالی

١١- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أَنَّ ابْنَ آدَمَ هَرَبَ مِنْ رِزْقِهِ، كَمَا يَهْرُبُ مِنَ الْمَوْتِ، لأَدْرَكَهُ رِزْقُهُ، كَمَا يُدْرِكُهُ الْمَوْتُ»}(١).

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئادەمیزاد لەو ڕزقەی (خوا بۆی داناوە) ڕابکاو هەڵبێ هەروەك چۆن بە (هەموو شێوەیەك) لە مردن ڕادەکاو هەڵدێ، ئەوە ئەو ڕۆزیەی (خوا بۆی داناوە) دەیگاتێ (لە کات و شوێنی خۆی) هەروەك چۆن مردنیش (لە کات و شوێنی خۆی) دەیگاتێ.**

١٢- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنِ مَسعودٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَخْلَاقَكُمْ كَمَا قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَرْزَاقَكُمْ، وَإِنَّ اللَّهَ لَيُعْطِي الدُّنْيَا مَنْ أَحَبَّ وَمَنْ لَا يُحِبُّ وَلَا يُعْطِي الدِّينَ إِلَّا مَنْ أَحَبَّ، فَمَنْ أَعْطَاهُ الدِّينَ فَقَدْ أَحَبَّهُ»}(٢).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بێگومان خوا ڕەوشتی لە نێوانتان دابەش کردوە، هەروەك چۆن ڕزق و ڕۆزی لە نێوانتان دابەش کردوە، وە بە دڵنیایی خوا (ماڵی) دونیا دەبەخشێ بە هەر کەسێك کە خۆشی بووێ، یان خۆشی نەوێ (جیاوازی ناکات)، بەڵام دین تەنها دەبەخشێ بەو کەسانەی کە خۆشی دەوێن، جا هەر کەسێك خوا دینداریی پێبەخشی ئەوە بە دڵنیایی خۆشی ویستووە.**

---

(١) أخرجه أبو نعيم في « الحلية » (٧/ ٩٠، ٧/ ٢٤٦) ، وابن عساكر (٢/ ١١ / ١)، انظر صَحِيح الْجَامِع: ٥٢٤٠، الصَّحِيحَة: ٩٥٢.

(٢) أخرجه الحاكم: ٣٦٧١، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، قال الذهبي:صحيح.

١٣- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُطْلِقُ نَاقَتِي وَأَتَوَكَّلُ؟ أَوْ أَعْقِلُهَا وَأَتَوَكَّلُ؟، قَالَ: «اعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ»}[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەم بەڕەڵڵا بکەم و پشت بە خوا ببەستم، یاخود بیبەستمەوەو پشت بە خوا ببەستم؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بیبەستەوەو پشت بە خوا ببەستە.

تێبینی: کەواتە: بەستنەوە پێچەوانەی پشت بە خوا بەستن نیە، بەڵکو ئەگەر پشتت بە خوا بەست، دەبێ دڵت بە خواوە پەیوەست بێ، بەڵام دەبێ دەستت بە هۆکارەکانەوە بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ وایکردوە، بۆیە ئەوەی کە هەندێ کەس بە هەڵە تێیگەیشتوون و پێیان وایە کە پشت بە خوا بەستوو کەسێکە کە هۆکارەکان وێڵ بکات! ئەوە لە ڕاستی هەر لە بنچینەدا لە مانای (تَوَکّل) حاڵی نەبووە، وە ئەوەی کە دەستی بە هۆکارەکانەوە نەبێ، ڕاست ناکات بڵێ: دڵی بە خواوە پەیوەستە، چونکە ئەو خوایەی کە دڵت پێوە پەیوەستە، ئەو پێت دەفەرموێ: هۆکارەکان ڕەچاو بکە، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی (ذو القرنین) فەرموویەتی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ ﴾الكهف، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (ذو القرنین) پێیان بڵێ: هەواڵی ئەوتان بۆ دەخوێنمەوە، ئێمە ئەومان دەستەڵاتدار کردبوو لە زەویدا، وە بۆ هەموو شتێك هۆکارێکمان پێدابوو، جا بە دوای هۆکارەکە دەکەوت.

کەواتە: پشت بە خوا بەستن لەگەڵ پەنا بۆ هۆکار بردندا، نەك هەر ناکۆك نیە، بەڵکو تەواوکەریی یەکدین، چونکە ئینسان تەنیا لایەنە مەعنەوییەکەی نیە، هەروەك تەنیا لایەنە جەستەییەکەش نیە، بە لایەنە

---

(١) أخرجه ابْنُ حِبَّانَ: ٧٣١، وَالتِرْمِذِي: ٢٦١٧، وحسنه كل من الألباني وشعيب الأرنؤوط.

جەستەییەکەی هۆکار پەیدا دەکات و، بە لایەنە مەعنەوییەکەشی دڵ پەیوەست دەکات بە خواوە.

## دەربارەی: هاوبەش دانان بۆ خوای تعالی

١٤- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْمُوجِبَتَانِ؟ قَالَ: «مَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ دَخَلَ النَّارَ»}[(١)].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پێویستکەرەکان (کە چوونە بەهەشت، یان دۆزەخ واجب دەکەن) چین؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێك بمرێ و هاوبەشی بۆ خوا دانەنابێ، دەچێتە بەهەشتەوە، وە هەر کەسێك بمرێ و هاوبەشی بۆ خوا دانابێ، دەچێتە دۆزەخـەوە.**

١٥- {عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمُ الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ؟ قَالَ: «الرِّيَاءُ إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: يَوْمَ تُجَازَى الْعِبَادُ بِأَعْمَالِهِمْ اذْهَبُوا إِلَى الَّذِينَ كُنْتُمْ تُرَاءُونَ بِأَعْمَالِكُمْ فِي الدُّنْيَا، فَانْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ عِنْدَهُمْ جَزَاءً»}[(٢)].

**واتە: مەحموودی کوڕی لەبید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شتێك کە زۆر مەترسیم لێی هەیە بەرانبەرتان شیرکی بچووکە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! شیرکی بچووك چییە؟ فەرمووی: ڕووپامایی، (ئەوەیە شتێك بکەی بەشی غەیری خوای تێبخەی). جا خوا لەو ڕۆژەی پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە (بە ڕیابازان) دەفەرموێ: بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی ئێوە ڕیابازیتان لە پێناو دەکردن و کردەوە چاکەکانتان بۆ**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ١٥١.

(٢) أخرجه أحمد: ٢٣٦٨٦، وَقَالَ شُعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيح.

**ئەوان ئەنجامدەدا لە دونیا، بزانن هیچ پاداشتتان لەلای ئەوان دەست دەکەوێ؟**

١٦- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ»}[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ شت لە هەر کەسێکدا هەبن ئەو کەسە شیرینی ئیمانی بە هۆی ئەو سێ شتانەوە چێشتوە، کە خواو پێغەمبەری خوای لە غەیری خۆیان خۆشتربوێ، (هیچ شتێکی هێندەی خوا، پاشان پێغەمبەر ﷺ خۆشنەوێ)، وە کە کەسێکی خۆشویست تەنیا لەبەر خوا خۆشی بوێ، وە پێی ناخۆشبێ بگەڕێتەوە بۆ کوفر، دوای ئەوەی خوا دەربازی کردوە لێی، وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە نێو ئاگر.**

١٧- {عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ، أَوْ أَشْرَكَ»}[٢].

**واتە: سەعدی کوڕی عوبەیدە دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوە کوفری کردوە، یاخود شیرکی کردوە، (واتە: کوفرو شیرکی گچکە).**

١٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ»}[٣].

---

(١) أخرجه البُخَارِيُّ: ١٦.
(٢) أخرجه إِبْنُ حِبَّانَ: ٤٣٥٨، وَصَحَّحَهُ الألباني.
(٣) أخرجه أحمد: ١٠٤٣٨، وَمُسْلِمٌ: ٦٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو ڕەفتارو سیفەت لە خەڵکیدا هەن، بە هۆیانەوە تووشی کوفر دەبن: تانەدان لە ڕەچەڵەك و شین گێڕان (لالانەوە) لەسەر مردوو.

تێبینی: دیارە ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ هەر کەسێك ئەم کردەوانەی کرد کافر بێ، بەڵام کردەوەکە لە ئەسڵدا هی کافرانەو، ئەو مسوڵمانەی ئەم کردەوانە بکات سیفەتێکی ئەهلی کوفری لە خۆیدا بەرجەستە کردوە.

## دەربارەی: گوێڕایەڵی کردن تەنیا لە چاکەدایە

١٩- {عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْخَالِقِ»}(١).

واتە: عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گوێڕایەڵی دروستکراوەکان ناکرێ لە سەرپێچی کردنی دروستکار (کە خوای پەروەردگارە).

## دەربارەی: دایك و باوك

٢٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «رَغِمَ أَنْفُهُ، رَغِمَ أَنْفُهُ، رَغِمَ أَنْفُهُ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ؟ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ، أَوْ أَحَدَهُمَا، فَدَخَلَ النَّارَ»}»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لووتی بە خۆڵدا بچێ، لووتی بە خۆڵدا بچێ، لووتی بە خۆڵدا بچێ! گوتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەو کەسەی بە دایك و باوکی، یان بە یەکێکیان ڕادەگات

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٠٦٧٢، قَالَ شُعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ.
(٢) أخرجه مسلم: ٢٥٥١.

**کە پیرو بە تەمەن دەبن لە لای، کەچی چووەتە دۆزەخیش (واتە: بای ئەوەندە خزمەتی نەکردبن کە پێی بچێتە بەهەشت).**

٢١- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الْعَاقُّ لِوَالِدَيْهِ، وَمُدْمِنُ الْخَمْرِ، وَالْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى»}[(١)].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ (جۆرە کەس هەن) خوا تەماشایان ناکات لە ڕۆژی قیامەت: ئەو کەسەی ئەزیەتی دایك و باوکی داوە، ئەو کەسەی بەردەوام بووە لەسەر خواردنەوەی شەڕاب (تا مردن)، ئەو کەسەی خێرێك دەکات و دوایی منەت لەسەر ئەو کەسە دەکات کە خێری پێکردوە.**

٢٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أَبَاكَ»}[(٢)].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: گوترا: (واتە: یەکێك گوتی:) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کێ زۆرچاکەکاربم؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: باوکت. (کەواتە: دایك سێ پلە لە پێش باوکەوەیە، بۆ چاکە لەگەڵ کردن).**

٢٣- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُمَدَّ لَهُ فِي عُمْرِهِ، وَيُزَادَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، فَلْيَبَرَّ وَالِدَيْهِ وَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»}[(٣)].

---

(١) أخرجه إبْنُ حِبَّانَ: ٧٣٤٠، قَالَ شُعيب الأرنؤوط: إسْنَادهُ صَحِيحٌ.

(٢) أخرجه البخاري ٥٩٨٧، ومسلم: ٢٥٥٤.

(٣) أخرجه الترمذي: ١٨٩٩، والبيهقي في شعب الإيمان: ٧٨٢٩، والحاكم: ٧٢٤٩، وقال: صحيح على شرط مسلم.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك حەز دەکات تەمەنی درێژ بکرێتەوەو ڕزق و ڕۆزی بۆ زیاد بکرێ، ئەوە با چاکە لەگەڵ دایك و باوکی بکات، وە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنێ.

٢٤- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «رِضَى الرَّبِّ فِي رِضَى الْوَالِدِ، وَسَخَطُ الرَّبِّ فِي سَخَطِ الْوَالِدِ»}[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: ڕەزامەندی خوا لە ڕەزامەندی دایك و باوك دایە، توڕەبوونی خواش لە توڕەبوونیان دایە.

٢٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَرْفَعُ الدَّرَجَةَ لِلْعَبْدِ الصَّالِحِ فِي الْجَنَّةِ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ، أَنَّى لِي هَذِهِ؟ فَيَقُولُ: بِاسْتِغْفَارِ وَلَدِكَ لَكَ»}[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە ڕاستی خوا پلەو پایەی بەندەی صاڵح بەرز دەکاتەوە لە بەهەشت، (ئەویش) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئەوە لە کوێوە بۆ من هاتوە، پێی دەگوترێ: بە هۆی داوای لێخۆشبوون کردنی منداڵەکەتە کە دووعای بۆ کردووی.

## دەربارەی: گەورەیی زانست و زانیاریی

٢٦- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا، يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ»}[٣].

---

(١) أخرجه ابْنُ حِبَّانَ: ٤٣٢، وحَسَّنَهُ الألباني.

(٢) أخرجه أحمد: ١٠٦١٨، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ٧١ و ٣٩٧١.

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك خوا چاکەی بۆی بوێ، لە ئایین شارەزای دەکات و تێی دەگەیەنێ.

٢٧- {عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ عَلَّمَ عِلْمًا فَلَهُ أَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهِ، لَا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الْعَامِلِ»}[١].

واتە: موعازی کوڕی ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك یەکێك فێری زانست بکات (ئەویش کاری پێبکات)، ئەوە هەمان پاداشتی بکەرەکەی هەیە، بێ ئەوەی لە پاداشتی بکەر کەم ببێتەوە.

٢٨- {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ، وَالْحِلْمُ بِالتَّحَلُّمِ، وَمَنْ يَتَحَرَّ الْخَيْرَ يُعْطَهُ، وَمَنْ يَتَّقِ الشَّرَّ يُوقَهُ»}[٢].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دەستهێنانی زانست تەنیا بە خۆ فێرکردن دەبێ، وە نەرم و نیانیش بە خۆڕاهێنان دەبێ لەسەر نەرم و نیانی، وە هەر کەسێك بە دوای چاکە بگەڕێ، چاکەی پێ دەدرێ، هەر کەسێکیش خۆی لە خراپە بپارێزێ دەپارێزرێ.

٢٩- {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّهُ لَيَسْتَغْفِرُ لِلْعَالِمِ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ، وَمَنْ فِي الْأَرْضِ، حَتَّى الْحِيتَانِ فِي الْبَحْرِ»}[٣].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بێگومان ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەتا نەهەنگیش لە دەریادا داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ زاناو مامۆستا.

---

(١) أخرجه ابْنُ مَاجَهْ: ٢٤٠، وحَسَّنَهُ الألباني.

(٢) أخرجه الخطيب في تاريخه ج٩، ص١٢٧، وَالطبراني في الصغير: ٢٦٦٣، انظر: صَحِيح الْجَامِع: ٢٣٢٨.

(٣) أخرجه ابْنُ مَاجَهْ: ٢٣٩، وَصَحَّحَهُ الألباني.

٣٠- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ»}[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داواکردنی زانست پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێك.**

٣١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَطْلُبُ فِيهِ عِلْمًا، سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا مِنْ طُرُقِ الْجَنَّةِ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ڕێگەیەك بگرێتە بەر بۆ فێربوونی زانستێك، خوا ڕێگایەك لە ڕێگاکانی چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات.**

٣٢- {عَنْ صَفْوَانَ بْنَ عَسَّالٍ الْمُرَادِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ خَارِجٍ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ يَطْلُبُ الْعِلْمَ، إِلَّا وَضَعَتْ لَهُ الْمَلَائِكَةُ أَجْنِحَتَهَا، رِضًا بِمَا يَصْنَعُ»}[٣].

**واتە: صەفوانی کوڕی عەسالی مورادی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ کەسێك نیە کە لە ماڵەکەی بێتە دەرەوە بۆ فێربوونی زانست، ئەوە حەتمەن فریشتە باڵەکانی بۆی ڕادەخەن وەك ڕێزو ڕەزامەندی بۆ ئەو کارەی کە دەیکات.**

٣٣- {عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يَقُولُ: «الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ، مَلْعُونٌ مَا فِيهَا، إِلَّا ذِكْرَ اللَّهِ، وَمَا وَالَاهُ، أَوْ عَالِمًا، أَوْ مُتَعَلِّمًا»}[٤].

---

(١) أخرجه إبن ماجه: ٢٢٤، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٣٦٤١، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أخرجه إِبْنُ مَاجَهْ: ٢٢٦، وابن حبان: ٨٥، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن

(٤) أخرجه إِبْنُ مَاجَهْ: ٤١١٢، انظر: صحيح الجامع: ١٦٠٩، الصحيحة: ٢٧٩٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە کاتێکدا دەیفەرموو: دڵنیابن دونیا دوورخراوەیە لە سوودو ڕەحمەت، وە ئەوەی تێشیدایە دوورخراوەیە لە سوودو ڕەحمەت، جگە لە یادی خواو ئەوەی پەیوەندی بە یادی خوا هەیە، وە جگە لە زانایەك (کە لە دینی خوا شارەزایە)، یان قوتابیەکی زانست کە دەیەوێ زانیاریی بە دەست بێنێ و شارەزابێ.

## دەربارەی: چاکەکاریی لەگەڵ خەڵك

٣٤- {عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: لَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ لِي: «يَا عُقْبَةُ بْنَ عَامِرٍ، صِلْ مَنْ قَطَعَكَ وَأَعْطِ مَنْ حَرَمَكَ، وَاعْفُ عَمَّنْ ظَلَمَكَ[1]، وأحْسِنْ إِلَى مَنْ أَسَاءَ إِلَيْكَ، وَقُلِ الحقَّ وَلَوْ عَلَى نَفْسِكَ»}[2].

واتە: عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی ﷺ دەڵێ: گەیشتم بە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەی عوقبەی کوڕی عامر! پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسە بەردەوام بکە کە وازت لێ دێنێ، وە بەو کەسە ببەخشە کە مەحرومی کردی، وە لەو کەسە خۆشبە کە ستەمی لێ کردی، چاکە لەگەڵ ئەو کەسە بکە کە خراپەی لەگەڵ کردی، ڕاستی بڵێ ئەگەر لەسەر خۆشت بێ و بە زیانی خۆت بێ.

٣٥- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَحِمَ اللَّهُ عَبْدًا سَمْحًا إِذَا بَاعَ، سَمْحًا إِذَا اشْتَرَى سَمْحًا إِذَا اقْتَضَى»}[3].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ کە ئاسانکارو لێبوردەیە کاتێك کە (شتێك) دەفرۆشێ، کاتێك

---

(١) أخرجه أحمد: ١٧٤٨٨، انظر: الصَّحِيحَة: ٨٩١ ، صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: ٢٥٣٦.

(٢) أخرجه رزين، انظر صَحِيح الْجَامِع: ٣٧٦٩، الصحيحة: ١٩١١، صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: ٢٤٦٧.

(٣) أخرجه البخاري: ١٩٧٠، والترمذي: ١٣٢٠.

کە (شتێك) دەکڕێ، کاتێك مافێکی هەیەو داوای دەکاتەوە (یان دادوەری دەکات لە نێوان دوو کەس بە دادگەری).

٣٦- {عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ إِذَا بَعَثَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي بَعْضِ أَمْرِهِ قَالَ: «بَشِّرُوا وَلَا تُنَفِّرُوا، وَيَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا»}[١].

**واتە: ئەبوو موسای ئەشعەریی رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك یەکێك لە هاوەڵانی دەنارد بۆ هەندێ لە کاروبارەکانی دەیفەرموو: موژدەدەربن (بۆ خەڵکی)و دووریان مەخەنەوە (لە دین)، وە ئاسان کاربن، سەختگیریی و قورسی مەکەن (لە دیندا).**

٣٧- {عَنْ عَامِرٍ، أَنَّ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا) حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَاهُ انْطَلَقَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللّهِ ﷺ يَحْمِلُهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّهِ، إِنِّي أُشْهِدُكَ أَنِّي قَدْ نَحَلْتُ النُّعْمَانَ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: «أَكُلَّ وَلَدَكَ نَحَلْتَ؟» قَالَ: لاَ، قَالَ: «فَأَشْهِدْ غَيْرِي»، ثُمَّ قَالَ: «أَلَيْسَ يَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا فِي الْبِرِّ سَوَاءً؟» قَالَ: بَلَى، قَالَ: «فَلاَ إِذاً»}[٢].

**واتە: عامِر دەڵێ: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێیان ڕازی بێ) گێڕاویەتیەوە کە باوکی هەڵیگرتوەو بردوویەتی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من تۆ دەکەم بە شایەد کە ئەوەو ئەوەم لە ماڵی خۆم داوە بە نوعمان، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بە هەموو منداڵەکانی دیکەت داون؟ گوتی: نەخێر، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: کەواتە کەسێکی دی غەیری من بکە بە شایەد، پاشان فەرمووی: ئایا پێتخۆش نیە (منداڵەکانت) لە چاکەکاری لەگەڵتدا هەموو وەك یەك بن؟ گوتی: با، فەرمووی: مادام تۆ وامەکە (یانی: کەواتە تۆش جیاوازی مەکە لە نێوانیان).**

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٩، ومُسْلِم: ٦٩.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٤٤٦.

٣٨- {عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَوْصِنِي، قَالَ: «إِذَا عَمِلْتَ سَيِّئَةً، فَأَتْبِعْهَا حَسَنَةً تَمْحُهَا»}[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: ئەگەر کارێکی خراپت کرد، دوای ئەو کاری چاکە بکە، خراپەکە دەسڕێتەوە.

٣٩- {عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ»}[٢].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: لە هەر شوێنێك بوویت پارێز لە خوا بکە، هەر خراپەیەکیشت کرد چاکەیەکی بە دوادا ئەنجام بدە، خراپەکەت دەسڕێتەوە، وە بە ڕەوشتی جوان هەڵسوکەوت و مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دا بکە.

٤٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ»}[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە جوانی و باشی مسوڵمانەتی ئەوەیە مرۆڤ پرسیار لە شتێك نەکات کە پەیوەندی بەوەوە نیە.

## دەربارەی: گومانی باش بردن بە خەڵك

٤١- {عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ»}[٤].

---

(١) أخرجه أحمد: ٢١٤٨٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره.
(٢) أخرجه التِرْمِذِيُّ: ١٩٨٧، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَحَسَّنَهُ الألباني.
(٣) أخرجه التِرْمِذِيُّ: ٢٣١٨، وَحَسَّنَهُ الألباني.
(٤) أخرجه البخاري: ٥١٤٣، ومسلم: ٢٥٦٣.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داواتان لێدەکەم (خۆتان دووربگرن) لە گومانی خراپ بردن (بە خەڵك)، لەبەر ئەوەی گومانی خراپ گەورەترین درۆیە.

٤٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُبْصِرُ أَحَدُكُمُ الْقَذَاةَ فِي عَيْنِ أَخِيهِ، وَيَنْسَى الْجِذْعَ فِي عَيْنِهِ»}[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێك لە ئێوە پوشکە لە چاوی براکەی دەبینێ، (واتە: عەیبی زۆر بچووکی براکەی دەبینێ)، بەڵام کاریتەی لە نێو چاوی خۆی نابینێ، (واتە: کەچی گوناهی گەورەی خۆی نابینێ).

## دەربارەی: پاراستنی سپاردەو بەڵێن

٤٣- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ بِالْحَدِيثِ، ثُمَّ الْتَفَتَ، فَهِيَ أَمَانَةٌ»}[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك قسەی بۆ پیاوێك کرد، پاشان ڕووی وەرگێڕاو ئاوڕی دایەوە، ئەوە ئەمانەتە (واتە: ئەو قسە دەبێتە ئەمانەت لە لای و نابێ بۆ کەسی بگێڕێتەوە).

٤٤- {عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَمِقِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَيُّمَا رَجُلٍ أَمِنَ رَجُلًا عَلَى دَمِهِ ثُمَّ قَتَلَهُ، فَأَنَا مِنَ الْقَاتِلِ بَرِيءٌ، وَإِنْ كَانَ الْمَقْتُولُ كَافِرًا»}[٣].

واتە: عەمری کوڕی حەمیق ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك پیاوێك دڵنیا بکاتەوە، لەسەر ئەوەی کە نایکوژێ و ئەمانی

---

(١) أخرجه إبْنُ حِبَّانَ: ٥٧٦١، وصححه الألباني.

(٢) أخرجه أبو داود: ٤٨٦٨، انظر: صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: ٢٠٢٥

(٣) أخرجه ابْنُ حِبَّان: ٥٩٨٢، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

پێبدات، دواییش بیکوژێ، من بەریم لەو بکوژە، هەرچەندە ئەو کوژراوە کافریش بێ.

٤٥- {عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْبِرِّ وَالْإِثْمِ، قَالَ: «الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ»}[(١)].

**واتە: نەوواسی کوڕی سەمعانی ئەنصاڕیی ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ پرسی دەربارەی چاکەو خراپە؟ ئەویش فەرمووی ﷺ: چاکە: ڕەوشت جوانییە، خراپەش: بریتیە لەو شتەی لە نێو سینەت دێت و دەچێت و پێت ناخۆشەو حەزناکەی خەڵك پێی بزانێ.**

## دەربارەی: نەرم و نیانی

٤٦- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ الرِّفْقَ لَا يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ، وَلَا يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ»}[(٢)].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی نەرم و نیانی لە هەر شتێکدا هەبێ جوانی دەکات، وە لە هەر شتێکدا دابڕنرێ ناشرینی دەکات.**

٤٧- {عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لَا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ»}[(٣)].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی خوا نەرم و نیانە، نەرم و نیانیشی خۆشدەوێ، وە ئەو (پاداشتەی) لەسەر نەرم و نیانی دەیبەخشێ لەسەر توندی نایبەخشێ.**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٢٥٥٣.

(٢) أخرجه مُسْلِمٌ: ٦٧٦٧ .

(٣) أخرجه أحمد: ٩٠٢، ومُسْلِم: ٦٧٦٦.

## دەربارەی: ئاگاداربوونی زمان

٤٨- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَمَتَ نَجَا»}[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بێ دەنگ بوو، ئەوە ڕزگاری بووە. (دیارە مەبەست لێرەدا ئەوەیە ئەو کەسە مادام قسان ناکات ڕزگاری بووە لە: بوختان، غەیبەت، نەمیمی، درۆو هاوشێوەیان..).**

٤٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قسەیەکی خۆش چاکەیەکە.**

٥٠- {عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»}[٣].

**واتە: ئەبو شورەیحی خوزاعی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاك بکات یان بێدەنگ بێ و قسەنەکات.**

٥١- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْثَرُ خَطَايَا ابنِ آدَمَ فِي لِسَانِهِ»}[٤].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆربەی گوناهو هەڵەکانی نەوەی ئادەم بە هۆی زمانیەوەیە.**

---

(١) أخرجه التِرْمِذِيُّ: ٢٦١٦، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه البُخَاري: ٢٨٢٧ .

(٣) أخرجه: البُخَارِيُّ: ٥٦٧٢، ومسلم: ٤٧.

(٤) أخرجه البَيْهَقِيُّ في «شُعَب الإيـمَان»: ٤٩٢٣، وَصَحَّحَهُ الألباني في «الصَّحِيحَة»: ٥٣٤

٥٢- {عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلَاثًا: قِيلَ وَقَالَ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ»}[١].

**واته: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا سێ شتی بۆ ئێوە پێ ناخۆشە: (کەسێك هەر قسان بگێڕتەوەو بڵێ: ئاواو ئاوا) گوتراو (فڵان و فیسار) گوتی، وە ماڵ بە فیڕۆدان و زێدەڕۆیی کردن لە خەرج کردنیدا، وە زۆر پرسیار کردن (ی بێ سوود).**

٥٣- {عَنْ صُهَيْبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «عَجَبًا لِأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لِأَحَدٍ إِلَّا لِلْمُؤْمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ، صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ»}[٢].

**واته: صوهەیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاروباری ئینسانی ئیماندار سەیرە! ئیش و کاری ئەو هەمووی هەر خێرو چاکەیە، ئەوەش بۆ هیچ کەسێك نیە جگە لە ئیماندار، ئەگەر خۆشی تووش هات سوپاسگوزاریی لەسەر دەکات و پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر ناخۆشیی تووش هات خۆی لە بەرانبەر ڕادەگرێ و پاداشتی هەیە.**

## دەربارەی: ئاگادار بوونی دڵ

٥٤- {عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ يَقولُ: «أَلاَ إِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً: إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ؛ أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ»}[٣].

**واته: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئاگاداربن لە جەستەدا پارچەیەك هەیە،**

---

(١) أخرجه البخاري: ١٤٠٧، ومُسْلِم: ٦٧٦٦ .

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٧٦٩٢ .

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ٥٢، ومسلم: ١٠٧.

ئەگەر چاك بوو جەستە هەمووی چاك دەبێ، وە ئەگەر خراپ بوو جەستە هەمووی خراپ دەبێ، ئاگاداربن ئەویش دڵە.

٥٥- {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ»}[١].

واتە: ئوممو سەلەمە دایکی بڕواداران (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆرجار دەیفەرموو: ئەی هەڵگێڕەوەی دڵان! دڵم لەسەر دینەکەت بچەسپێنە.

٥٦- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: "إِنَّ العَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ، وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففين»}[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێك بەندە گوناهێكی كرد خاڵێكی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ، جا ئەگەر وازی لێ هێناو داوای لێبوردنی كردو گەڕاوە (بۆ لای خوا)و تۆبەی كرد، دڵی سپی دەبێتەوە، وە ئەگەر گوناهەكانی بەردەوام بوون خاڵە ڕەشەكان زیاد دەكەن هەتا دەبێتە ژەنگ بەسەر دڵیەوەو تەواو كەمەڕی لەسەر دەبەستی ئەوە ئەوەیە كە خوا باسی كردوە (كە فەرموویەتی): ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾المطففين، واتە: نەخێر ڕاست ناكەن، بەڵكو دڵیان بە هۆی گوناهەكانەوە كەمەڕی بەستووەو ژەنگیان هێناوەو داخراوە.

---

(١) أخرجه ابْنُ أَبِي حَاتِم: ٣٢٢٢، وَالطَّبَرِي فِي «تفسيره»: ٦٦٥٠، وَالتِّرْمِذِيُّ: ٢١٤٠، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي «الكَبير»: ٧٧٢، وَرَوَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا نَحوَهُ، انظر: «السلسة الصحيحة» رقم: ٢٠٩١.
(٢) أخرجه التِّرْمِذِيُّ: ٣٣٣٤، وَحَسَّنَهُ الألباني في «صحيح الترغيب والترهيب»: ٢٤٦٩،

## دەربارەی: داهێنرانی زیاده له ئایین

٥٧- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ، فَهُوَ رَدٌّ»}[1].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك شتێك لەم دینەمان دابێنێ و تێیدا نەبێ ئەوه ڕەد کراوەیەو لێی وەرناگیرێ.**

٥٨- {عن عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها)، أَنَّ رسُولَ اللّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا، فَهُوَ رَدٌّ»}[2].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ، ئەوه ڕەد کراوەیەو لێی وەرناگیرێ.**

٥٩- {عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللّهِ ﷺ: «مَا بَقِيَ شَيْءٌ يُقَرِّبُ مِنَ الْجَنَّةِ، ويُبَاعِدُ مِنَ النَّارِ، إِلَّا وَقَدْ بُيِّنَ لَكُمْ»}[3].

**واته: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێك نەماوه نیزیکتان بکاتەوه له بەهەشت و دوورتان بخاتەوه له ئاگر، حەتمەن بۆتان ڕوون کراوەتەوه (و پێم ڕاگەیاندوون).**

٦٠- {عَن عَبْد الرَّحْمَنِ بْن عَمْرٍو السُّلَمِيُّ وَحُجْرِ بْنِ حُجْرٍ قَالا: أَتَيْنَا الْعِرْبَاضَ بْنَ سَارِيَةَ ﷺ وَهُوَ مِمَّنْ نَزَلَ فِيهِ: ﴿وَلاَ عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ ﴿٩٢﴾﴾ التوبة، فَسَلَّمْنَا وَقُلْنَا: أَتَيْنَاكَ زَائِرِينَ

---

(١) أخرجه البُخَارِيُّ: ٢٥٥٠، ومسلم: ١٧١٨.

(٢) أخرجه البُخَارِيُّ: ٢٥١٧١ .

(٣) أخرجه الطَّبَرَنِيُّ في «الكبير»: ١٦٤٧، وإبن حبان: ٦٥، وَصَحَّحَهُ الألباني.

وَعَائِدِينَ وَمُقْتَبِسِينَ فَقَالَ عِرْبَاضٌ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصُّبْحَ ذَاتَ يَوْمٍ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا، فَوَعَظَنَا مَوْعِظَةً بَلِيغَةً ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ، وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! كَأَنَّ هَذِهِ مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ فَمَاذَا تَعْهَدُ إِلَيْنَا؟ فَقَالَ: أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، وَإِنْ كَانَ عَبْدًا حَبَشِيًّا، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلافًا كَثِيرًا فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، فَتَمَسَّكُوا بِهَا وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ}[1].

**واته: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەمڕی سولەمیی و حوجری کوڕی حوجر هەردووکیان دەڵێن: چووین بۆ لای عیربازی کوڕی سارییه ﷺ، که لەو کەسانه بوو ئەم ئایەتەیان دەرباره هاته خوار:** ﴿ وَلاَ عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ ﴿٩٢﴾ ﴾التوبة، **سڵاومان لێکردو پێمان گوت: هاتووین هەم سەردانت بکەین و هەواڵت بپرسین که نەخۆشی، هەم سوودو زانیاریت لێوەربگیرن، عیربازیش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان نوێژی بەیانی بۆ کردین، دوایی سڵاوی نوێژەکەی دایەوەو ڕووی تێکردین و ئامۆژگاریەکی زۆر کاریگەری کردین، که چاوەکان فرمێسکیان لێهات، وه دڵەکان لەرزین و ڕاچڵەکین، یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئامۆژگاریەت وەك ئامۆژگاری کەسێکه که ماڵئاوایی بکات، جا کۆتا ئامۆژگارییمان به چی دەکەی؟ فەرمووی: ئامۆژگاریتان دەکەم به پارێز کردن له خواو، فەرمانبەری بۆ "بەرپرسانی خۆتان" ئەگەر ئەو بەرپرسه کۆیلەیەکی حەبەشەییش بێ، چونکه هەر یەکێکتان دوای من بژیێ جیاوازی زۆر دەبینێ، بەڵام ئێوه ڕێبازی من بگرن، وه ڕێبازی جێنشینه سەر ڕاستەکان بگرن، به ددانەکانتان بیگرن (واته: به هەموو شێوەیەك دەستی پێوه بگرن)، وه خۆتان له شته پەیدا کراوەکان دوور بگرن (که له دیندا جێگای نابێتەوه)، چونکه هەموو پەیداکراوێك (که**

---

(١) أخرجه أحمد: ١٧١٨، تعليق شعيب الأرنؤوط : حديث صحيح بطرقه وشواهده وهذا إسناد حسن.

لە دیندا جێگەی نەبێتەوە) داهێنراوە، وە هەموو داهێنراوێکیش (کە لە دیندا جێگەی نەبێتەوە) گومڕاییە.

## دەربارەی: داپۆشینی گوناهی خۆمان و خەڵك

٦١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى إِلَّا الْمُجَاهِرِينَ، وَإِنَّ مِنَ الْإِجْهَارِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ فِي اللَّيْلِ عَمَلًا ثُمَّ يُصْبِحُ وَقَدْ سَتَرَهُ رَبُّهُ، فَيَقُولُ: يَا فُلَانٌ، عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا كَذَا، وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ يَبِيتُ فِي سِتْرِ رَبِّهِ، وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللَّهِ عَنْهُ»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەموو ئۆممەتەکەم دەبووردرێن (لە گوناهان)، تەنیا ئەو کەسانە نەبن کە گوناهان دەکەن و دوایی دێن لە نێو خەڵکی باسی دەکەن، وە یەکێك لە ئاشکرا کردن ئەوەیە کەسێك بە شەو کردەوەیەکی خراپ ئەنجام بدات، لە کاتێکدا خوا بۆی داپۆشی بێ، کەچی خۆی بڵێ: ئەی فڵان دوێنێ شەو ئاواو ئاوام کرد، لە کاتێکدا کە شەوی لە ژێر داپۆشین و پەردەی خوا کردبۆوە، جا بەیانی دەکاتەوە و پەردەکەی خوا لەسەر خۆی لادەدات و تاوانەکەی ئاشکرا دەکات (ئا لەو کەسانە نابوردرێت، چونکە خۆیان نەیانویستووە).

٦٢- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ سَتَرَ عَوْرَةَ أَخِيْهِ الْمُسْلِمِ، سَتَرَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ كَشَفَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، كَشَفَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ حَتَّى يَفْضَحَهُ بِهَا فِي بَيْتِهِ»}[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك عەیبی برای مسوڵمانی داپۆشێ، خوا لە ڕۆژی

---

(١) أخرجه البُخَارِيُّ: ٥٧٢١، ومسلم: ٢٩٩٠

(٢) أخرجه إِبْنُ مَاجَةْ: ٧٠٢٨، وَصَحَّحَهُ الألباني.

قیامەت عەیبی دادەپۆشێ، وە هەر کەسێکیش عەیبی برای مسوڵمانی خۆی ئاشکرا بکات (بۆ خەڵکی) خوا عەیبی ئاشکرا دەکات، هەتا ئابڕووی دەبات ئەگەر لە نێو ماڵەکەی خۆشیدا بێ.

٦٣- {عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ كَلَامَاً نَفَعَنِي اللَّهُ بِهِ، سَمِعْتُهُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّكَ إِذَا اتَّبَعْتَ الرِّيبَةَ فِي النَّاسِ أَفْسَدْتَهُمْ» فَإِنِّي لاَ أَتَّبِعُ الرِّيبَةَ فِيهِمْ فَأُفْسِدَهُمْ»}[1].

واتە: موعاویە ﷺ، دەڵێ: چەند قسەیەکم بیست لە پێغەمبەر ﷺ بە هۆیانەوە خوا سوودی پێگەیاندم، لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: دڵنیابە ئەگەر تۆ بە گومان دوای (عەیب و کەم و کوڕی) بکەوی لە نێو خەڵکیدا، ئەوە تێکیان دەدەی (عەیب و کەم و کوڕییەکان ئاشکرا دەبن، فەسادو خراپەکاریی دەبێتە شتێکی ئاشکراو سادە)، من هەرگیز بە دوای گومان ناکەوم لە نێو خەڵکیدا بۆ ئەوەی تێکیان بدەم.

## دەربارەی: ڕەچەڵەك کەس پێش ناخات

٦٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ»}[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کردەوەکەی دوای بخات، ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات.

تێبینی: پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەگەر کەسێك لە کارو کردەوەی باشە کەم و کوڕی تێدابێ، ناگات بە پلەو پایەی ئەوانەی خاوەن کارو کردەوەی تەواون، بۆیە نابێ و ناگونجێ لێی پاڵبداتەوەو تەنبەڵی بکات بە ئومێدی ئەوەی لە بنەچەو عەشیرەت و

(١) أخرجه البُخَارِيُّ في الأدب المفرد: ٢٤٨.

(٢) أخرجه أحمد: ٧٤٢١، ومسلِم: ٢٦٩٩، والترمذي: ٢٩٤٥، وأبو داود: ٣٦٤٣.

ڕەچەڵەکی دەگاتەوە بە کەسانێك خاوەن کارو کردەوەی چاکن و سوودی پێدەگەیەنن، چونکە ئینسان تەنها ئەوەی بۆ هەیە لە پاداشت ئەنجامی دەدات لە کردەوەی باش[1].



(١) النووي ج٩ص ٦٣.

٦٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ صَالِحَ الأَخْلَاقِ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی من ڕەوانەکراوم بۆ ئەوەی ڕەوشتە چاکەکان تەواو بکەم.**

٦٦- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ يَأْلَفُ وَيُؤْلَفُ، وَلَا خَيْرَ فِيمَنْ لَا يَأْلَفُ وَلَا يُؤْلَفُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیماندار هۆگری خەڵکی (باش) دەبێ و خۆشی دەوێن، خەڵکیش هۆگری خۆی دەکات، وە خێر لەو کەسەدا نیە کە هۆگری خەڵکی (باش) نەبێ و خۆشی نەوێن، نەتوانێ خەڵکیش هۆگری خۆی بکاو خۆشیان بوێ.**

٦٧- {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي المِيزَانِ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ»}[٣].

**واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: هیچ شتێك نیە لە تەرازووی (کردەوە چاکەکاندا) قورستر بێ لە ڕەوشت جوانی.**

٦٨- {عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ»}[٤].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: هیچ شتێك لە چاکەکردن بە کەم مەزانە، ئەگەرچی تۆ بگەیە برای خۆت بە ڕوویەکی گەش و خۆشەوە (هەر چاکەت بۆ دەنووسرێ).**

---

(١) أخرجه البَيْهَقِي في «الكبرى»: ٢٠٥٧١، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه أحمد: ٩١٨٧ ، والطَّبَرَانِيُّ في «الأوسط»: ٥٧٨٧، وَصَحَّحَهُ الألباني، وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

(٣) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٤٧٠١، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٤) أخرجه مُسْلِمٌ: ٦٨٥٧ .

٦٩- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ فَاحِشاً وَلاَ مُتَفَحِّشاً، وَكَانَ يَقُولُ: «خِيَارُكُمْ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلاَقاً»}[١].

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: بە هیچ جۆرێك پێغەمبەر ﷺ زمان شڕو جنێو فرۆش نەبووە، وە هەمیشە دەیفەرموو: باشترینتان ڕەوشت جوانترینتانە.**

٧٠- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا، وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَإِنْ كَانَ مَازِحًا، وبِبَيْتٍ فِي أَعْلَى الْجَنَّةِ لِمَنْ حَسَّنَ خُلُقَهُ»}[٢].

**واته: ئەبو ئومامەی باهیلیی رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من گرەنتی خانوێك دەدەم لە دەوروبەری (یان لە بەشەکانی کۆتایی) بەهەشت بۆ کەسێك، کە واز لە موناقەشەو شەڕە قسە کردن بهێنێ ئەگەر لەسەر هەقیش بێ، وە من گرەنتی خانوێك دەدەم لە نێوەڕاستی بەهەشت بۆ کەسێك کە واز لە درۆکردن دەهێنێ ئەگەر بۆ گاڵتەشی بێ، وە گرەنتی دەدەم بەماڵێك لە بەرزترینی بەهەشت بۆ کەسێك کە ڕەوشتی خۆی جوان بکات.**

٧١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِكُلِّ دِينٍ خُلُقٌ، وَخُلُقُ الْإِسْلَامِ الْحَيَاءُ»}[٣].

**واته: ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو ئاینێك ڕەوشتی تایبەت بە خۆی هەیە، وە ڕەوشتی ئیسلام بریتیە لە شەرم و حەیا.**

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٦٨٨، ومسلم: ٢٣٢١.

(٢) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٤٨٠٢، وَحَسَّنَهُ الألباني.

(٣) أخرجه البَيْهَقِيُّ: ٧٧١٢، حلية الأولياء: ج٦، ص٣٤٦، وَحَسَّنَهُ الألباني.

٧٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ»}(١).

**واته: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیمان حەفتاو ئەوەندە بەشەیە، شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان.**

٧٣- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ»}(٢).

**واته: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سوپاسی خەڵك نەکات (کە چاکەیان لەگەڵ کردوە) ئەوە سوپاسی خوای نەکردوە (چونکە خوا ئەو کەسانەی بۆ موسەخخەر کردوە تا چاکەی لەگەڵ بکەن).**

٧٤- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ»}(٣).

**واته: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو بەنی ئادەم (هەرچی مرۆڤە) هەڵەکارن و هەڵان دەکەن، وە باشترینی هەڵەکاران ئەوانەن کە پێداچوونەوە بۆ خۆیان دەکەن و زۆرو زوو تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە.**

٧٥- {عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ، فَيَتَصَافَحَانِ إِلَّا غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا»}(٤).

---

(١) أخرجه مسلم: ٥٧.

(٢) أخرجه التِرْمِذِيُّ: ١٩٥٥، وَقَالَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. قال الألباني: صحيح لغيره.

(٣) أخرجه إبن ماجه: ٤٢٥١ ، وَحَسَّنَهُ شعيب الأرنؤوط.

(٤) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٥٢١٢، وَصَحَّحَهُ الألباني.

**واتە: بەڕڕاء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر دوو مسوڵمانێك بە یەكدی بگەن و تەوقە بكەن، ئەوە بە مسۆگەری و دڵنیایی پێش ئەوەی لە یەكدی جیاببنەوە (خوا) لە گوناهی هەردووكیان خۆش دەبێ.**

٧٦- {عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «المُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضاً»، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ}[١].

**واتە: ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیماندار بۆ ئیماندار وەك بینا وایە، هەندێكی هەندێكی توندو پتەو دەكەن. (ڕاوی دەڵێ: كە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەكانی دەفەرموون)، پەنجەی دەستەكانی خستنە نێو یەكدی.**

٧٧- {عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ يَقُولُ: «خَيْرُكُمْ إِسْلَامَاً أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقَاً إِذَا فَقِهُوا»}[٢].

**واتە: موحەممەدی كوڕی زیاد، دەڵی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو ﷺ، دەیگوت: گوێم لە ئەبو قاسم بوو (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ) دەیفەرموو: باشترینتان لە دوای ئیسلام بوون ئەوانەتانن ڕەوشتیان زۆر جوانە، ئەگەر لە ئایین تێبگەن و شارەزابن.**

٧٨- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ: يِهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقاً، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ فَإِنَّ الْكَذِبَ: يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّاباً»}[٣].

---

(١) أخرجه البُخَارِيُّ: ٥٦٨٠ .

(٢) أخرجه أحمد: ١٠٠٦٨، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ٥٧٤٣، وَمُسْلِمٌ: ٦٨٠٥، وَاللَّفْظُ لَهُ.

واتە: عەبدوڵلا(ی کوڕی مەسعوود) ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: داواتان لێدەکەم دەست بە ڕاستگۆییەوە بگرن، بێگومان ڕاستگۆیی ڕێنماییە بۆ (هەموو کردارو گوفتارێکی) چاکە، وە چاکەش ڕێنماییە بۆ بەهەشت! وە پیاوی وا هەیە هێندە ڕاستگۆیەو عەوداڵی ڕاستییە هەتا لەلای خوا ناوی بە ڕاستگۆ دەنووسرێ، وە داواتان لێدەکەم خۆتان بپارێزن لە درۆکردن، چونکە بێگومان درۆکردن ڕێنماییە بۆ خراپەکاریی و لادان لە ڕێی ڕاست، وە خراپەکارییش ڕێنماییە بۆ ئاگر، وە پیاوی وا هەیە هێندە درۆ دەکات و عەوداڵی درۆیە هەتا لەلای خوا ناوی بە درۆزن دەنووسرێ.

## دەربارەی: ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك

٧٩- {عَنِ أُمِّ كُلْثُومٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُا)، قَالَتْ: سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ، فَيَقُولُ خَيْرًا، أَوْ يَنْمِي خَيْرًا»}[1].

واتە: ئوم کەلسوم (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بە درۆزن دانانرێ ئەو کەسەی قسە ڕێك دەخاو نێوانی خەڵکی چاك دەکاتەوە، قسەی چاك دەکات، یان قسەی چاکە دێنێ و دەبات.

٨٠- {عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى صَدَقَةٍ يُحِبُّهَا اللّهُ وَرَسُولُهُ؟ تُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ إِذَا تَبَاغَضُوا وَتَفَاسَدُوا»}[2].

واتە: ئەبو ئەییوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئایا هەواڵت پێنەدەم بۆ ئەنجامدانی خێرێك کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان بوێ؟ (کە بریتیە لە): ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك کاتێك کە لێك تووڕە دەبن و ئاشووب لە نێوانیان دروست دەبێت.

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٥٤٦، ومسلم: ٢٦٠٥.

(٢) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ في الكبير: ٣٩٢٢، وعبد بن حميد: ٢٣٢، والبيهقي في شعب الإيمان: ١١٠٩٣، وَحَسَّنَهُ الألباني.

٨١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا عَمِلَ ابْنُ آدَمَ شَيْئًا أَفْضَلَ مِنْ الصَّلَاةِ، وَصَلَاحِ ذَاتِ الْبَيْنِ وَخُلُقٍ حَسَنٍ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کردەوەیەکی بەنی ئادەم نیە باشتربێ لە: نوێژو، چاککردنەوەو ئاشتکردنەوەی نێوان خۆیان و، ڕەوشت جوانی.**

## دەربارەی: برادەر و هاوەڵیەتی

٨٢- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئینسان (بە پیاوو ئافرەتەوە) لەسەر ڕەوشت و ڕێبازی دۆست و هاوەڵیەتی، جا با هەر یەك لە ئێوە باش تەماشا بکاو (بیر بکاتەوە بزانێ) کێ دەکات بە دۆست و هاوەڵی خۆی!**

٨٣- {«عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُؤْمِنُ مَرْآةُ أَخِيهِ، وَالْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ، يَكُفُّ عَلَيْهِ ضَيْعَتَهُ، وَيَحُوطُهُ مِنْ وَرَائِهِ»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیماندار ئاوێنەی براکەیەتی، ئیماندار برای ئیمانداره، قەدەغەی دەکات لە فەوتان و خەسارەتمەندیی و، دەیپارێزێ و پشتی دەگرێت (بۆ سەرخستنی).**

٨٤- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ "يَعْنِي" يَقُولُ: «لاَ يَأْخُذْ أَحَدُكُمْ مَتَاعَ صَاحِبِهِ لاَعِباً، وَلاَ جَاداً، فَإِذَا أَخَذَ أَحَدُكُمْ عَصَا صَاحِبِهِ فَلْيَرُدَّهَا إِلَيْهِ»}[٤].

---

(١) أخرجه البَيْهَقِيُّ في «شعب الإيمان»: ١١٠٩١، والبخاري في التاريخ الكبير (٦٣/١)، وَصححه الألباني.

(٢) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٤٨٣٧، وَحَسَّنَهُ الألباني.

(٣) أخرجه أبو داود: ٤٩١٨، البخاري في الأدب المفرد: ٢٣٩.

(٤) أخرجه أحمد: ١٧٩٦٩، وأبو داود: ٥٠٠٣، والترمذي: ٢١٦٠.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب لە باوکی ئەویش لە باپیری (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست، واتە: دەیفەرموو: با هیچ یەکێك لە ئێوە کەل و پەلی براکەی نەبات و نەیشارێتەوە نە بە گاڵتەو نە بەڕاستی، بۆیە ئەگەر یەکێك لە ئێوە گۆپاڵی برادەرەکەی بردوە، با بۆی بگەڕێنێتەوە (ئەو جۆرە گاڵتەوگەپانە مەکەن).

٨٥- {عَنْ أَبِي سَعِيد ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِنًا، وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ»}[١].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: برادەرایەتی کەس مەکە جگە لە ئیماندار، وە با نانیشت نەخوات (بە ناوی دەعوەت و دەعوەتکاری) جگە لە کەسی بە تەقواو پارێزکار.

## دەربارەی: خەون بینین

٨٦- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ السِّتَارَةَ وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلَّا الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ»}[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (کاتێك نەخۆش کەوت لە ماڵی خۆیەوە) پەردەی (دەرگاکەی لادا)، لە کاتێکدا خەڵکی لە دوای ئەبو بەکرەوە ڕیز بوو بوون (بۆ نوێژ)، ئنجا فەرمووی: ئەی خەڵکینە! بە دڵنیایی لە دوای پێغەمبەران هیچ شتێك لە موژدەدەرەکان (لە ئیلهامە دڵخۆشکەرەکان لە لایەن خواوە نەماون)، تەنیا خەونی چاك و ڕاست ماوە، کە پیاوی باش دەیبینێ، یان پێوەی دەبینرێ (ئەوە ئیلهامی خوایە دێنەجێ).

---

(١) أخرجه أحمد: ١١٣٥٥، والدارمي: ٢٠٥٧، وأبو داود: ٤٨٣٢، والترمذي: ٢٣٩٥ وقال: حسن، وَحَسَّنَهُ الألباني.
(٢) أخرجه مُسْلِمٌ: ٤٧٩ .

٨٧- {عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»}[١].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خەونی بڕوادار، (جا چ پیاو بێ، چ ئافرەت)، بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی (واتە: جۆرێکە لە ئیلهام خوا دەیبەخشێ).**

٨٨- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ قالَ: قالَ رَسُولُ اللّه ﷺ: «مَنْ رَآني في المَنامِ فَقدْ رَآني؛ فَإنَّ الشَّيْطَانَ لا يَتَمَثَّلُ بِي»}[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە خەوندا منی بینی، ئەوە بە ڕاستی منی بینیوە، چونکە شەیتان نایەتە سەر شێوەی من.**

٨٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ، لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا، أَصْدَقُكُمْ حَدِيثًا»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کۆتا زەمان نزیکبوویەوە، ئەوە خەونی کەسی مسوڵمان ناڕاست دەرناچێ، وە ڕاسترینتان لە ڕووی خەونەوە ڕاستگۆترینتانە لە ڕووی قسەوە.**

## دەربارەی: دوعاو پاڕانەوە کردن

٩٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَمْ يَدْعُ اللَّهَ سُبْحَانَهُ، غَضِبَ عَلَيْهِ»}[٤].

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٩٨٧، ومسلم: ٢٢٦٤، والترمذي: ٢٢٧١.

(٢) أخرجه البُخَارِيُّ: ٦٥٩٣ .

(٣) أخرجه مسلم: ٢٢٦٣.

(٤) أخرجه ابْنُ مَاجَهْ: ٣٨٢٧، وَحَسَّنَهُ الألباني.

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك داوا لە خوای پاك و بێگەرد نەکات و لێی نەپاڕێتەوە خوا لێی تووڕە دەبێ.**

٩١- {عَنْ ثَوْبَانَ رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا يَرُدُّ الْقَدَرَ إِلَّا الدُّعَاءُ، وَلَا يَزِيدُ فِي الْعُمُرِ إِلَّا الْبِرُّ»}[١].

**واتە: ئەوبان ﷺ گێڕاویەتیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێك قەدەری خوا ڕەت ناکاتەوە جگە لە دووعاو پاڕانەوە، وە هیچ شتێکیش تەمەن درێژ ناکات جگە لە چاکە کردن (لەگەڵ خەڵك بە گشتی و دایك و باب بە تایبەتی).**

٩٢- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ لَا تُرَدُّ: دَعْوَةُ الْوَالِدِ، وَدَعْوَةُ الصَّائِمِ وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ»}[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ دووعا هەن ڕەت ناکرێنەوە: دوعای دایك و باوك، وە دوعای ڕۆژووەوان، وە دوعای گەشتیارو ڕێبوار.**

٩٣- {عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَسْتَحْيِي إِذَا رَفَعَ الرَّجُلُ إِلَيْهِ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا خَائِبَتَيْنِ»}[٣].

**واتە: سەلمانی فارسی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا بەشەرمە (وەك چۆن کەسێك شەرم بکات و نەتوانێت نەبەخشێت کاتێك داوای لێ دەکەن) وە بەڕێزیشە (ڕێز لە بەندەی خۆی دەگرێت و پێی دەبەخشێ)، پێی ناخۆشە (وەك کەسێك کە شەرم بکات و پێی ناخۆش بێت خەڵك ڕەت بکاتەوە) ئەگەر پیاوێك دەستەکانی بەرز**

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٢٤١٣، قال شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره.

(٢) أخرجه البَيْهَقِيُّ في «الكُبرى»: ٦١٨٥، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أخرجه الترمذي: ٣٥٥٦، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ وَحَسَّنَهُ الألباني.

**بکاتەوەو لێی بپاڕێتەوە ڕەتی بکاتەوە بە بەتاڵی، (واتە: حەتمەن شتێکی پێ دەبەخشێت).**

٩٤- {عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ الْعِبَادَةُ»، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴿٦٠﴾﴾غافر}[1].

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خودی دوعاو پاڕانەوە پەرستشە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴿٦٠﴾﴾غافر، واتە: [داوام لێبکەن و لێم بپاڕێنەوە، وەڵامتان دەدەمەوە].**

٩٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللَّهِ سُبْحَانَهُ مِنَ الدُّعَاءِ»}[2].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێك نیە لە دوعا کردن بەڕێزتر بێ لە لای خوای پاك و بێگەرد.**

٩٦- {عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً»}[3].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامت رضي الله عنه دەڵێ: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك (لە خوا بپاڕێتەوەو) داوای لێ خۆشبوون بۆ ئیماندارانی پیاوو ئافرەت بکات بە ئەندازەی ژمارەی ئیماندارانی پیاوو ئافرەت خوا چاکەی بۆ دەنووسێ.**

---

(١) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٧١٤.

(٢) أخرجه إبن ماجه: ٣٨٢٩، وَحَسَّنَهُ الألباني.

(٣) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ في «مُسْنَد الشاميين»: ٢١٥٥، قَالَ الهَيْثَمِيُّ: إِسْنَادُهُ جَيِّد.

٩٧- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ، أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ، أَوْ يَسْتَعْجِلَ فَيَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَا أَرَى يَسْتَجِيبُ لِي، فَيَدَعُ الدُّعَاءَ»}(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوعای هەر یەکێك لە ئێوە وەڵام دەدرێتەوە مادام داوایەکە گوناح نەبێ، یاخود پەیوەندی پچڕاندنی نێوانی خزمان نەبێ، یان پەلە نەکات و بڵێت: دوعام کردو نەمبینی خوا وەڵامم بداتەوە، بۆیە واز دێنێ لە دوعاو پاڕانەوە.

٩٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا، لَذَهَبَ اللَّهُ بِكُمْ، وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ، فَيَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ»}(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە، ئەگەر (وەك فریشتە) گوناح نەکەن ئەوە خوا لە ناوتان دەبات، وە گەلێکی دیکە دێنێت (وەك مرۆڤ وابێ) کە گوناح بکەن و داوای لێ خۆشبوون لە خوا بکەن و ئەویش لێیان خۆش دەبێ.

٩٩- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِذَا دَعَوْتُمُ اللّهَ فَاعْزِمُوا فِي الدُّعَاءِ، وَلَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِنِي، فَإِنَّ اللّهَ لَا مُسْتَكْرِهَ لَهُ»}(٣).

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر داواتان لە خوا کرد لە کاتی پاڕانەوە، ئەوە بە پێداگری و سوور بوون داوا بکەن، وە با یەکێك لە ئێوە نەڵێ: خوایە ئەگەر دەتەوێ (پێتخۆشە) پێم بدە، چونکە هیچ کەس ناتوانێ بە زۆر شت لە خوا بسەنێ، (هەر بە ویستی

---

(١) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٦٥٥.

(٢) أخرجه أحمد: ٨٠٦٨، ومسلم: ٢٧٤٩.

(٣) أخرجه البخاري ٧٠٢٦.

خۆیەتی، بەڵام ئێوە ئەو ویستە دەرمەبڕن و ساردو سڕی مەکەن، بەڵکو بە هەژارییەوە پێداگری بکەن و خۆتان تاڕادەیەك بێ منەت پێشان مەدەن).

١٠٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ قَالَ: «يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي»}(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوعای هەر یەکێك لە ئێوە وەڵام دەدرێتەوە مادام پەلە نەکات، (پەلەکردنیش ئەوەیە کە یەکێك) دەڵێ: دوعام کردو وەڵام نەدرامەوە.

## دەربارەی: زیکرو یادی خوا

١٠١- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَا مِنْ سَاعَةٍ تَمُرّ بِـابْنِ آدَمَ، لَمْ يَذْكُر اللّهَ فِيهَا، إِلاَّ تَحَسَّرَ عَلَيْهَا يَوْمَ الْقِيَامَة»}(٢).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کاتێك نیە کە تێپەڕ دەبێت بەسەر وەچەی ئادەم و زیکری خوای تێدا ناکات، حەتمەن داخ و حەسرەتی لەسەر دەخوات لە ڕۆژی دواییدا.

١٠٢- {عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيَّانِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا: يَا رَسُولَ اللّهِ، أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ فَقَالَ: «طُوبَى لِمَنْ طَالَ عُمْرُهُ، وَحَسُنَ عَمَلُهُ» فَقَالَ الآخَرُ: أَيُّ الْعَمَلِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «أَنْ تُفَارِقَ الدُّنْيَا وَلِسَانُكَ رَطْبٌ مِنْ ذِكْرِ اللّهِ عَزَّ وَجَلَّ» قَالَ: يَا رَسُولَ اللّهِ، وَيَكْفِينِي؟ قَالَ: «نَعَمْ وَيَفْضُلُ عَنْكَ»}(٣).

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٣٤٠، ومسلم: ٢٧٣٥.

(٢) أخرجه البَيْهَقِيُّ في «شعب الإيمان»: ٥١١، أنظر: (صحيح الجامع): ٥٧٢٠.

(٣) أخرجه أبو نعيم فى الحلية (١١١/٦)، والبغوي في الجعديات: ٣٤٣١، وابن أبي عاصم في الآحاد والمثاني: ١٣٥٦، وَصَحَّحَهُ الألباني (المشكاة) ٢٢٧٠.

واتە: عەبدوڵلای کوڕی بوسر ﷺ دەڵێ: دوو دەشتەکی هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، یەکێکیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترینی خەڵك کامەیە؟ فەرمووی ﷺ: خۆشیی و سەرفرازی بۆ ئەو کەسەی تەمەنی درێژەو کردەوەی باشن، ئنجا ئەوی دیکەیان گوتی: ئەی کام کردوە باشترینە؟ فەرمووی: ئەوەیە کاتێك لە دونیا جیادەبیەوە زمانت بە یادی خوای زاڵی پایەدار تەڕ بێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەندەم بەسە؟ فەرمووی: بەڵێ، لێشت زیادە.

١٠٣- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «طُوبَى لِمَنْ وَجَدَ فِي صَحِيفَتِهِ اسْتِغْفَارًا كَثِيرًا»}[١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی بوسر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشیی و بەختەوەری بۆ ئەو کەسەی، کە لە دەفتەری (کردەوەکانی) داوای لێبوردن کردنی زۆری هەبێ.

١٠٤- {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَفْضَلُ الذِّكْرِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الْحَمْدُ لِلَّهِ»}[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: چاکترین زیکری خوا کردن گوتنی: (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ)یە، وە چاکترین دوعاش (الْحَمْدُ للهِ)یە (چونکە خوای پەروەردگار بە شوکرو ستاییش کردنی نیعمەت و بەخشش زیاد دەکات، دوعاش هەر بۆ داواکردنی بەخششە).

١٠٥- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ كَمَنْ لاَ ذَنْبَ لَهُ»}[٣].

---

(١) أخرجه الترمذي: ٣٣٨٣، وقال : حسن غريب، وابن ماجه: ٣٨٠٠، وابن حبان: ٨٤٦، وَصَحَّحَهُ الألباني.
(٢) أخرجه التِرْمِذِيُّ: ٣٣٨٣، وَحَسَّنَهُ الألباني.
(٣) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ في «الكَبير»: ٧٧٥، وَحَسَّنَهُ الألباني.

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەشێمانی کەسی تەوبەکار لە گوناح، وەك ئەو کەسە وایە کە گوناهی نەکردبێ.**

١٠٦- {عَنْ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعْوَةُ ذِي النُّونِ إِذْ دَعَا وَهُوَ فِي بَطْنِ الْحُوتِ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنْ الظَّالِمِينَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا اسْتَجَابَ اللَّهُ لَهُ»}(١).

**واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوعای ذی نون (واتە: پێغەمبەر یونس علیه السلام)، کاتێك لە نێو سکی حووت بوو، (ئەمە بوو): (لَا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ)، واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە تۆ (ئەی خودایە!) پاکی و بێگەردی بۆ تۆ، وە من لە ستەمکاران بووم، وە بێگومان هیچ مسوڵمانێك نیە کە دوعای پێ بکات بۆ هەر شتێك، حەتمەن خوا وەڵامی دەداتەوە.**

١٠٧- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ»}(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو وشە هەن زۆر سووکن لە سەر زمان، گران و قورسن لە تەرازوو (ی کردەوەکان)، خۆشەویستن لە لای ڕەحمان (واتە: خوا)، کە بریتین لە: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيم)، واتە: پاکی و بێگەردیی و ستایش بۆ خوای مەزن.**

---

(١) أخرجه التِرْمِذِيُّ: ٣٥٠٥، وَصَحَّحَهُ الألباني.
(٢) أخرجه البُخَارِيُّ: ٦٠٤٣ .

١٠٨- {عَنِ المُنذِر ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: يَقُولُ: «مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ: رَضِيتُ بِاللّهِ رَبّاً، وَبِالإِسْلَامِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيّاً، فَأَنَا الزَّعِيمُ لآخُذَنَّ بِيَدِهِ حَتَّى أُدْخِلَهُ الجَنَّة»}[١].

**واتە: مونزیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر مسوڵمانێك لە كاتی بەرەبەیاندا گوتی: ڕازیم خوا پەروەردگارم بێ، ئیسلام ئایین و بەرنامەم بێ، موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەرم بێ، ئەوە من گرەنتی ئەوەی دەدەمێ دەستی بگرم هەتا دەیبەمە نێو بەهەشتێ.**

١٠٩- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْـرَبَ الشَّـرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا»}[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا بەوە لە بەندەكەی ڕازی دەبێ، كە خواردنێك بخوات و ستایشی بكات لەسەری، وە خواردنەوەیەك بخواتەوەو ستایشی بكات لەسەری.**

١١٠- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «التَّأَنِّي مِنَ اللّهِ وَالْعَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَمَا مِنْ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَى اللّهِ مِنَ الْحَمْدِ»}[٣].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەرخۆیی لە خواوەیە، وە پەلە كردن لە شەیتانەوەیە، بەڕاستی هیچ شتێك بە ئەندازەی ستایش كردن لە لای خوا خۆشەویستتر نیە.**

١١١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَأَى مُبْتَلًى فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلَاكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلًا، لَمْ يُصِبْهُ ذَلِكَ الْبَلَاءُ»}[٤].

---

(١) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ: ٨٣٨، قال الهيثمي (١١٦/١٠): إسناده حسن، وَحَسَّنَهُ الألباني.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٧١٠٨ .

(٣) أخرجه أبو يعلى: ٤٢٥٦، وَحَسَّنَهُ الألباني.

(٤) أخرجه التِّرْمِذِيُّ: ٣٤٣٢، وَصَحَّحَهُ الألباني.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە کەسێکی بینی تووشی بەڵایێك ببوو گوتی: ستایش بۆ ئەو خوایەی منی پاراست لەوەی تووشی تۆی کردوە، وە فەزڵی منی داوە بەسەر زۆربەی دروستکراوەکانی (دیارە دەبێ لە دڵی خۆی وا بڵێ نەك بە شێوەیەك کەسەکە گوێی لێ بێ و دڵی بە خۆی بسوتێتەوە)، ئەوە لەو بەڵایەی تووش نابێ (واتە: خوای بەبەزەیی تووشی ئەم بەڵایەی ناکات).

## دەربارەی: جوان خوێندنەوەی قورئان

١١٢- {عَنْ عُثْمَان ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيّ ﷺ: «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ»}[١].

واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە فێری قورئان دەبێت و خەڵکیش فێر دەکات.

١١٣- {عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ»}[٢].

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قورئان جوان بکەن و بیرازێننەوە بە دەنگەکانتان.

١١٤- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ»}[٣].

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی کارامە لە قورئان (لە خوێندنی و تێگەیشتی و کارپێکردنی)دا، ئەوە لەگەڵ فریشتە چاکەکارە بەڕێزەکانی خوان (کە ڕێزی تایبەتیان پێ دراوە لە ناو فریشتەکان)، وە ئەو کەسەی کە قورئان

---

(١) أخرجه البُخَارِي: ٤٧٣٩.
(٢) أخرجه أَبُو دَاوُد: ١٤٧٠، وَصَحَّحَهُ الألباني.
(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ٤٦٥٣.

دەخوێنێ، بەڵام لەسەر زمانی تەواو نایێ (واتە: چاك نایزانێ) و لە سەری قورسە، ئەوە دوو پاداشتی هەیە. (پاداشتی خوێندنەکەی، وە پاداشتی ئەوەش کە پێوەی ماندووە، هەرچەند دەکات جوان فێر نابێ).

١١٥- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ»، قَالُوا: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَهْلُ الْقُرْآنِ هُمْ أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ»}[1].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا کۆمەڵێك کەسی تایبەتی هەیە لە نێو خەڵکیدا، گوتیان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوانەی هۆگری قورئانن کەسی خوان و، خەڵکی تایبەتی ئەون.**

١١٦- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ آيَةَ اَلْكُرْسِيِّ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ اَلْجَنَّةِ إِلَّا اَلْمَوْتُ»}[2].

**واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئایەتی (الكُرسي) بخوێنێ، لە دوای نوێژە فەڕزەکان، هیچ شتێك لە نێوان ئەوو بەهەشت نیە جگە لە مردن، ئەگەر مرد دەچێتە بەهەشت.**

١١٧- {عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ»}[3].

**واتە: ئەبو مەسعوودی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی بەقەڕە بخوێنێ لە شەودا بەسیەتی. (واتە: خوای پەروەردگار دەیپارێزێ، وە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەگەر ئەو کەسە ئەم شەوە بمرێ، ئەوە بە ئیمانەوە دەچێتە خزمەت خوای بەبەزەیی).**

---

(١) أخرجه الطيالسي: ٢١٢٤، وأحمد: ١٢٣٠١، وابن ماجه: ٢١٥، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه النسائي في الكبرى: ٩٩٢٨، والطبراني في الأوسط: ٨٠٦٨، والطبراني في الشاميين: ٨٢٤، قال الهيثمي: رواه الطبراني في الكبير والأوسط بأسانيد وأحدها جيد .

(٣) أخرجه البخاري: ٤٠٠٨، ومسلم: ٨٠٨.

١١٨- {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ، عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ»}[١].

**واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دە ئایەتی سەرەتای سوورەتی کەهف لەبەر بکات، دەپارێزرێ لە ئاشووبی دەججال.**

١١٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ سُورَةً مِنَ الْقُرْآنِ ثَلَاثُونَ آيَةً، شَفَعَتْ لِرَجُلٍ حَتَّى غُفِرَ لَهُ، وَهِيَ تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی سوورەتێکی قورئان هەیە، سی ئایەتە، شەفاعەت بۆ پیاوێك (یان هەر کەسێك دەکات کە بیخوێنێ) تاوەکو لێی دەبووردرێ (و خوا لێی خۆش دەبێ)، ئەویش سوورەتی: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾ە.**

١٢٠- {عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ إِجْلَالِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ»}[٣].

**واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە ڕێزگرتنی خوایە کە ڕێزی مسوڵمانێکی پیری موو سپی بگیرێ، وە ڕێزی کەسێك بگیرێ کە هەڵگری قورئانە (لەبەریەتی و کاری پێدەکات)، زێدەڕۆیی تێدا ناکات و کەمتەرخەمیشی تێدا ناکات، وە ڕێزگرتنی خاوەن دەسەڵاتی دادگەریش (ئەمانە گشتیان بەشێکن لە ڕێزگرتنی خوا، چونکە خوا فەرمانی کردوە بە ڕێزگرتنی ئەمانە، جا جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا ڕێزگرتنی خوایە).**

---

(١) أخرجه مسلم: ٨٠٩.

(٢) أخرجه النَّسَائِيُّ في الكُبرى: ٧١١، وَحَسَّنَهُ الألباني.

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ في «الأدب المفرد»: ٣٥٧، وَحَسَّنَهُ الألباني.

## دەربارەی: سەرپەرشتیاری بێوەژن و هەتیو

١٢١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ، وَالْمَسَاكِينِ، كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَكَالَّذِي يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيْلَ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە کۆشش دەکات بۆ خزمەت و سەرپەرشتی بێوەژن و کەسانی نەدار، ئەوە (پاداشتی) وەك ئەو موجاهیدەیە کە لە ڕێی خوادا دەجەنگی، هەروەها وەك ئەو کەسەش وایە کە بە شەو شەونوێژ دەکات و، بە ڕۆژیش ڕۆژوو دەگرێ.**

١٢٢- {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا»، وَقَالَ بِإِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى}[٢].

**واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: من و سەرپەرشتیاری هەتیو لە بەهەشتدا ئاواین، وە ئاماژەی بۆ پەنجەی شایەتمانی و پەنجەی نێوەڕاستی کرد (هێنانیە تەك یەك).**

## دەربارەی: خێرو صەدەقە کردن

١٢٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي تَرُدُّهُ التَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلَا اللُّقْمَةُ وَلَا اللُّقْمَتَانِ، إِنَّمَا الْمِسْكِينُ الَّذِي يَتَعَفَّفُ، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ يَعْنِي قَوْلَهُ: ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ﴿٢٧٣﴾﴾ البقرة»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نەدار بریتی نیە لەو کەسەی کە دنکە خورمایەك، یان دوو دنکە خورما قەناعەتی پێدێنێ،**

---

(١) أخرجه أحمد: ٨٧١٧، والبخاري: ٥٠٣٨، ومسلم: ٢٩٨٢.

(٢) أخرجه أحمد: ٢٢٨٧١، والبخاري: ٥٦٥٩، وأبو داود: ٥١٥٠.

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ١٤٧٩ .

یان پاروویەك و دوو پاروو، بەڵكو نەدار(ی حەقیقی) ئەوەیە: خۆی پاك دەگرێ لە داواكردن و سواڵ كردن و باسكردنی حاڵی خۆی، جا ئەگەر حەز دەكەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە (كە پەروەردگار دەفەرموێ): ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ﴿٢٧٣﴾﴾البقرة، واتە: داوا ناكەن لە خەڵكی بە پێداگری.

١٢٤- {عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَالصَّدَقَةُ عَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ»}[١].

واتە: سەلمانی كوڕی عامرِ ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خێركردن بە خەڵكی نەدار هەر خێرو چاكەیە، بەڵام بە خزمی نەدار، دوو شتە: هەم خێرو چاكەیەو هەم صیلەی ڕەحمیشی جێبەجێكردوەو (پەیوەندی خزمایەتیشی گەیاندوە).

١٢٥- {عَنْ أَبِي مَسْعُود البَدْرِيّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً عَلَى أَهْلِهِ، وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا كَانَتْ لَهُ صَدَقَة»}[٢].

واتە: ئەبو مەسعوودی بەدریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك خەرجیەك بكات بۆ ماڵ و منداڵەكەی، وە چاوەڕوانی پاداشتەكەشی بكات، ئەوە بۆی بە چاكە دەنووسرێ.

١٢٦- {عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ مِثْلِهِ صَدَقَةٌ»}[٣].

واتە: بورەیده ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر كەسێك چاوەڕێی نەدارو تەنگ دەستێك بكات (كە قەرزاریەتی) بە هەر ڕۆژێك بە قەد قەرزەكەی چاكەو خێری بۆ دەنووسرێ.

---

(١) أخرجه الترمذيّ: ٦٥٨، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه أحمد: ١٧١٢٣، والبخاري: ٥٠٣٦، ومسلم: ١٠٠٢.

(٣) أخرجه أحمد: ٢٣٠٩٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم رجاله ثقات رجال الشيخين.

١٢٧- {عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَسَيُكَلِّمُهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لَيْسَ بَيْنَ اللَّهِ وَبَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ، ثُمَّ يَنْظُرُ فَلاَ يَرَى شَيْئًا قدَّامَهُ، ثُمَّ يَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَتَسْتَقْبِلُهُ النَّارُ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَّقِيَ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ»}[١].

واتە: عەدیی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان نیە، مەگەر خوا لە ڕۆژی زیندووکرانەوەدا قسەی لەگەڵ دەکات، لە نێوان خواو ئەودا هیچ وەرگێڕێکی زمان نیە، پاشان تەماشا دەکات هیچ شتێك لە پێشەوە نابینێت، دوایی تەماشا پێش دەستی خۆی دەکات ئاگر ڕووبەڕووی دەبێتەوە، جا بۆیە خۆتان بپارێزن لە ئاگر ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێ.

١٢٨- {عَنْ جَرِيرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ»}[٢].

واتە: جەریر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چاکەیەك دابێنێ (کە ئەسڵی لە دیندا هەبێ)، ئەوە پاداشتی بۆ هەیە، وە پاداشتی هەموو ئەوانەشی بۆ هەیە کە کار بەو چاکەیە دەکەن (کە ئەو دەستپێشخەریی بۆ کردوە) بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بکرێتەوە.

تێبینی: (هۆکاری گوترانی ئەم فەرموودە: ڕۆژێك پیاوێك هات داوای هاوکاریی کرد، زۆر هەژار دیار بوو، پێغەمبەر ﷺ دەم و چاوی موبارەکی تاریك داهات و گرژ بوو، پێی ناخۆش بوو ئەو ئینسانەی وا بە هەژاریی و نەداریی بینی، دوایی یەکێك لە هاوەڵان هاوکارییەکی کرد، خەڵکەکەش کە لەوێ بوون ئەوانیش بە دوای ویدا هاوکاریی دیکەیان کرد، ئنجا

---

(١) أخرجه البُخَارِيُّ: ٦١٧٤ .

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٢٣٩٨ .

**پێغەمبەر ﷺ ڕووی موبارەکی وەك مانگ درەوشایەوە، وە لەو حاڵەتەدا فەرمووی: «مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً ...»).**

**١٢٩-** {عَنْ عُقْبَةَ بْن عَامِرٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الَّذِي يَجْهَرُ بِالْقُرْآنِ كَالَّذِي يَجْهَرُ بِالصَّدَقَةِ، وَالَّذِي يُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالَّذِي يُسِرُّ بِالصَّدَقَةِ»}[1].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە قورئان بە دەنگی بەرز دەخوێنێ، وەك ئەوەیە کە خێرو چاکە بە ئاشکرا دەکات، وە ئەوەی کە قورئان بەبێ دەنگی دەخوێنێ وەك ئەوە وایە کە خێرو چاکە بەپەنهانیی دەکات.**

---

(١) أخرجه النَّسَائِيُّ: ١٦٦٣، وَصَحَّحَهُ الألباني.

١٣٠- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ الْبَلَلَ وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَمًا قَالَ: «يَغْتَسِلُ»، وَعَنِ الرَّجُلِ يَرَى أَنْ قَدِ احْتَلَمَ وَلاَ يَجِدُ الْبَلَلَ قَالَ: «لاَ غُسْلَ عَلَيْهِ»، فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: فَالْمَرْأَةُ تَرَى ذَلِكَ أَعَلَيْهَا غُسْلٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ»}[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پیاو کە دەبینێ تەڕ بووەو لە بیریشی نیە خەونی بینی بێ، فەرمووی: خۆی دەشۆرێ (چونکە ڕەنگە خەونەکەی بیرچووبێتەوە)، وە دەربارەی پیاوێك کە خەونی بینیووەو تەڕ نەبووە، فەرمووی: خۆشۆردنی لەسەر نیە، ئوممو سولەیم گوتی: ئافرەتیش ئەمە دەبینێ (واتە: تەڕ دەبێ) ئایا خۆشۆردنی لەسەرە؟ فەرمووی: بەڵێ، بێگومان ئافرەتان نیوەو لەتکی پیاوانن (وەکو یەکن).**

١٣١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ»، أَوْ قَالَ «غَيْرَهُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ پیاوێکی ئیماندار هیچ ئافرەتێکی ئیماندار نەبوغزێنێ، ئەگەر ڕقی لە سیفەتێکی خراپی بوو، ئەوە سیفەتێکی دیکەی باشی هەیە کە لێی ڕازیە. واتە: با لەبەر سیفەتە باشەکەی خۆشی بوێ و چاوپۆشیش لە سیفەتە خراپەکەی بکات، (دیارە لە بەرانبەریشدا دیسان ئافرەتی ئیمانداریش نابێ پیاوی ئیماندار ببوغزێنێ، واتە: ژن و پیاو نابێ یەکدی ببوغزێنن، لەبەر چەند سیفەتێك کە تێیاندا هەیە بە دڵیان نیە).**

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٦٢٣٨، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث حسن لغيره، وَصَحَّحَهُ الألباني في سنن أبي داود.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ١٤٦٩.

١٣٢- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَحَدَا الْحَادِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْفُقْ يَا أَنْجَشَةُ "وَيْحَكَ" بِالْقَوَارِيرِ»}[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەرچوونێکدا بوو، وشترەوانەکەش وشترەکانی خستبووە پێشی خۆی و گۆرانی بۆ دەگوتن بۆ ئەوەی هانیان بدات لەسەر ڕۆیشتن (زۆر خێرای کردبوون)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئەی ئەنجەشە! لەسەرخۆو هێواشبە لەگەڵ شوشەکان (واتە: لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی سواری پشتی وشترەکان بوون)!**

١٣٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَكْمَلَ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا، وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُم لِنِسَائِكُمْ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئیمان تەواوترینی ئیمانداران ڕەوشت جوانترینیانە، وە باشترینتان باشترینتانن بۆ ژنەکانتان.**

١٣٤- {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ»}[٣].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەربارەی ژنان پارێز لە خوا بکەن، چونکە ئێوە ئەوانتان وەرگرتوە وەك ئەمانەت و سپاردەی خوا، وە داوێنتان بۆ خۆتان حەڵاڵ کردوە بە وشەی خوا. (واتە: بەو وشەیەی کە (إنكاح و تزوج) واتە: مارە کردن و جووت کردن، کە دیارە ئەو وشەیە لە قورئاندا هاتوە).**

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٥٦.

(٢) أخرجه أحمد: ١٠١١٠، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: صَحِيح، وَهَذَا إِسنَادٌ حَسَنٌ.

(٣) أخرجه مُسْلِم: ١٢١٨.

**١٣٥-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَا أَعْطَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فَهُوَ صَدَقَةٌ»}(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی ئومەییە دەگێڕێتەوە لە باوکی (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: هەر شتێك کە پیاو بە هاوسەرەکەی دەدات خێری بۆ دەنووسرێ.**

**١٣٦-** {عَنْ نَافِعِ بْنِ عَبْدِ الْحَارِثِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مِنْ سَعَادَةِ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ: الْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ، وَالْجَارُ الصَّالِحُ، وَالْمَرْكَبُ الْهَنِيءُ»}(٢).

**واتە: نافیعی کوڕی عەبدولحاریس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە بەختەوەری مرۆڤی مسوڵمان ئەوەیە: خانووێکی فراوان و، دراوسێیەکی چاك و، سواریەکی چاکی هەبێ.**

**١٣٧-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا»}(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ئامۆژگارییتان دەکەم) ئامۆژگاریی یەکدی بکەن دەربارەی ئافرەتان بە چاکە (واتە: بە چاکە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن).**

**١٣٨-** {عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَلَّتِ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا، وَصَامَتْ شَهْرَهَا، وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا، وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا، قِيلَ لَهَا : ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ»}(٤).

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژە فەڕزەکانی کردو، ڕەمەزانیش بە**

---

(١) أخرجه أحمد: ١٧٦٥٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ١١٦، وقال الألباني: صحيح لغيره.

(٣) أخرجه البخاري: ٥١٨٤، ومسلم: ١٤٦٨.

(٤) أخرجه أحمد: ١٦٦١، وإبن حبان: ٤١٦٣، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

ڕۆژوو بوو، داوێنی خۆشی پاراست لە حەڕام و، گوێڕایەڵی مێردەکەشی کرد (لە شتی شەرعیی) ئەوە پێی دەگوترێ: بڕۆ بەهەشتەوە لە کام دەرگای بەهەشت پێت خۆشە.

١٣٩- {عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ، مِنَ النِّسَاءِ»}[1].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ فیتنەو ئاشووبێك لە دوای من جێ نەماوە کە زۆرترین زیان و خراپەی بۆ پیاوان هەبێ لە ئافرەتان زیاتر (واتە: بە هۆی ئافرەتانی خراپەوە پیاوان دین و دونیایان دەڕوات، نەك ئافرەتانی دیندارو ڕێزدار، کە زۆرجار دەبنە هۆی هیدایەتدانی پیاوەکان).**

## دەربارەی: پاك و خاوێنی

١٤٠- {عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ»}[2].

**واتە: ئەبو مالیکی ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە.**

١٤١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا جُنُبٌ فَأَخَذَ بِيَدِي، فَمَشَيْتُ مَعَهُ حَتَّى قَعَدَ، فَانْسَلَلْتُ مِنْهُ، وَأَتَيْتُ الرَّحْلَ فَاغْتَسَلْتُ، ثُمَّ جِئْتُ وَهُوَ قَاعِدٌ؛ فَقَالَ: أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هِرٍّ فَقُلْتُ لَهُ، فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ يَا أَبَا هِرٍّ إِنَّ الْمُؤْمِنَ لاَ يَنْجُسُ»}[3].

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٨٠٨، ومسلم: ٢٧٤٠.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٥٥٦ .

(٣) أخرجه البُخَارِي: ٢٨١ .

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر پێم گەیشت لە کاتێکدا من لەشگران بووم، دەستمی گرت، جا لەگەڵی ڕۆیشتم تا دانیشت، دوایی خۆم لێ شاردەوەو چووم خۆم شۆرد، پاشان چوومەوە ئەو هەر دانیشتبوو، فەرمووی: ئەوە لە کوێ بووی ئەی ئەبو هیر، منیش پێم گوت (واتە: پێم گوت کە لەشگران بووم و حەزم نەکرد بەو حاڵە بمێنمەوە)، فەرمووی: بێگومان بڕوادار پیس نابێ.

١٤٢- {عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ جَسَدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِهِ»}[١].

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژ بە چاکی هەڵبگرێ، گوناهەکانی لە جەستەی دەچنە دەرەوە، هەتا لە ژێر نینۆکی پەنجەکانی دەچنە دەرەوە.

١٤٣- {عَنْ أَبُو أَيُّوبَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَوَضَّأَ كَمَا أُمِرَ، وَصَلَّى كَمَا أُمِرَ، غُفِرَ لَهُ مَا قَدَّمَ مِنْ عَمَلٍ»}[٢].

واتە: ئەبو ئەییوب ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێ بەو شێوەی کە فەرمانی پێکراوە، وە نوێژ بکات بەو شێوەی کە فەرمانی پێکراوە، لە کردەوە (خراپە)کانی ڕابردووی دەبوردرێ.

١٤٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كَفَّارَاتُ الْخَطَايَا إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَإِعْمَالُ الْأَقْدَامِ إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ»}[٣].

---

(١) أخرجه مُسْلِم برقم: ٢٤٥ .

(٢) أخرجه النَّسَائِيُّ: ١٤٤، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أخرجه الحاكم: ٤٥٦، وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَىٰ شَرْطِ مُسْلِم.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەفارەتەکانی هەڵەو گوناهەکان بریتین لە: جوان شوشتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ لە کاتی سەرماو سۆڵ و ناخۆشیدا، وە هەنگاو هاوێشتن و بەکارخستنی پێیەکان بەرەو مزگەوت، وە چاوەڕوان کردنی نوێژ دوای نوێژی ڕابردوو.

١٤٥- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ»}[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سیواك پاككەرەوەیە بۆ دەم و، هۆكاری ڕەزامەندی پەروەردگارە.

## دەربارەی: بانگ و بانگبێژان

١٤٦- {عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}[2].

واتە: موعاویە ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بانگ بێژەکان لە ڕۆژی دوایی دا گەردنیان لە هەموو کەس بەرزترە.

تێبینی: جا گەردنی ڕواڵەتییان بەرز دەبێ، یان مەبەست پێی ئەوەیە پایەیان بەرزە، بەڕاستیی ئەوانەی ئەو دروشم و شیعارە بە گوێی مسوڵمانانندا دەدەن لە قیامەت سەربەرزن و، ئەگەر مەبەست پێ گەردن بەرزییش بێ، مەبەست جوانیی قەدو قیافەکەیانە تا خەڵك هەمووی بیانناسنەوە و پلەو پایەیان ببینن.

---

(١) أخرجه البُخَارِي «معلقا»، وَالنَّسَائِيُّ: ٥، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه مُسلم برقم: ٣٨٧ .

١٤٧- {عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَذَّنَ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَكُتِبَ لَهُ بِتَأْذِينِهِ فِي كُلِّ يَوْمٍ سِتُّونَ حَسَنَةً، وَلِكُلِّ إِقَامَةٍ ثَلَاثُونَ حَسَنَةً»}[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێك دوازدە ساڵ بانگ بدات، بەهەشتی بۆ واجب دەبێت، وە بە هەموو بانگێك لە ڕۆژێكدا شەست چاكەو، وە بە هەموو قامەتێك سی چاکەی بۆ دەنووسرێ.**

١٤٨- {عَنْ جابِرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}[2].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك گوێی لە بانگ بوو، لەو کاتەدا گوتی: خوایە! ئەی پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوە، وە (پەروەردگاری) ئەم نوێژە دامەزراوە، ببەخشە بە موحەممەد ﷺ پلەی وەسیلە، وە (فَضِيلَة) و بیبە بۆ ئەو شوێنە سوپاسکراوەی کە پەیمانت پێداوە، (جا ئەگەر وای گوت) ئەوە شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێ.**

---

(١) أخرجه ابنُ مَاجَهْ: ٧٢٨، وَصَحَّحَهُ الألباني.
(٢) أخرجه البُخَارِيُّ: ٦١٤.

## دەربارەی: گەورەیی مزگەوت

١٤٩- {عَنْ عَائِشَة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ بَنَى مَسْجِداً لا يُرِيدُ بِهِ رِياءً ولا سُمَعَةً؛ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتاً في الجَنَّة»}[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك مزگەوتێك دروست بکات مەبەستی پێی ڕیابازیی و ناوبانگ بڵاوبوونەوە نەبێ، ئەوە خوا خانوێکی بۆ لە بەهەشت دروست دەکات.**

١٥٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَحَبُّ الْبِلاَدِ إِلَى اللَّهِ مَسَاجِدُهَا، وَأَبْغَضُ الْبِلاَدِ إِلَى اللَّهِ أَسْوَاقُهَا»}[2].

**واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترین شوێن لە لای خوا مزگەوتەکانن، وە بوغزێنراوترین شوێن لە لای خوا بازاڕەکانن (چونکە حەڕامی تێدا ئەنجام دەدرێ و، سوێندی بە درۆی تێدا دەخورێ).**

١٥١- {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، أَيْنَمَا أَدْرَكَ رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي الصَّلَاةَ صَلَّى»}[3].

**واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەر زەوییم هەمووی بۆ کراوە بە مزگەوت و بە پاککەرەوەش (واتە: بە تەیموم دەتوانێت خۆی پاك بکاتەوە لە بێ دەستنوێژی)، یەکێك لە ئوممەتەکەم گەیشت بە کاتی نوێژ دەکات لە هەر کوێیەك بوو، نوێژ ئەنجام بدات.**

---

(١) أخرجه الطَّبَرَاني في «الأوسط»: ٧٠٠١، وَحَسَّنَهُ الألباني.
(٢) أخرجه مُسْلِم: ٦٧١ .
(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ٣٣٥ ، والنسائي: ٧٣٦.

١٥٢- {عَنْ بُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}[١].

**واتە: بورەیدەی ئەسلەمی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: موژدە بدە بەو کەسانەی کە لە تاریکی بەرەو مزگەوت دەچن بە ڕووناکیەکی تەواو لە ڕۆژی دوایی.**

## دەربارەی: نوێژە فەڕزو سوننەتەکان

١٥٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قال: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ بِصَلَاتِهِ، فَإِنْ صَلَحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی یەکەم کردەوە کە بەندە لەسەری لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ لە ڕۆژی دوایی نوێژەکانیەتی، ئەگەر نوێژەکانی باش بوون ئەوە سەرفراز بووەو سەرکەوتوو بووە، بەڵام ئەگەر نوێژەکانی خراپ بوون، (واتە: بە تەواوی ئەنجامی نەدابن) ئەوە خەسارەتمەندو زەرەرمەند بووە.**

١٥٤- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا صَلَاةَ بِحَضْرَةِ طَعَامٍ، وَلَا هُوَ يُدَافِعُهُ الْأَخْبَثَانِ»}[٣].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: نوێژ ناکرێ لە کاتێکدا کە خواردن ئامادەیە، هەروەها لە کاتێکدا کە دوو شتە پیسەکان (مرۆڤ) سەغڵەت دەکەن (واتە: پیسایی و میز) نوێژ ناکرێ.**

---

(١) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٥٦١، وَصَحَّحَهُ الألباني

(٢) أخرجه أحمد: ٩٤٩٠، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أخرجه مُسْلِم: ٥٦٠.

١٥٥- {عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى لِلَّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا فِي جَمَاعَةٍ يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الْأُولَى، كُتِبَتْ لَهُ بَرَاءَتَانِ: بَرَاءَةٌ مِنَ النَّارِ، وَبَرَاءَةٌ مِنَ النِّفَاقِ»}(١).

**واته: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چل ڕۆژان نوێژی بە کۆمەڵ بکات بۆ خوا، وە بە تەکبیرە (اللّه أکبر)ی یەکەم ڕابگات، ئەوە دوو بەڕائەتی بۆ دەنووسرێن: بەری دەبێت لە ئاگر، وە بەری دەبێت لە دوو ڕوویی.**

١٥٦- {عَنْ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «إِنَّ كُلَّ صَلاَةٍ تَحُطُّ مَا بَيْنَ يَدَيْهَا مِنْ خَطِيئَةٍ»}(٢).

**واته: ئەبو ئەییوبی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیگوت: بێگومان هەموو نوێژێك گوناهەکانی پێش خۆی دەسڕێتەوەو هەڵیدەوەرێنێ.**

١٥٧- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تَزِيدُ عَلَى صَلَاتِهِ وَحْدَهُ سَبْعًا وَعِشْرِينَ»}(٣).

**واته: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی پیاو بە کۆمەڵ (پاداشتی) بە بیست و حەوت پلە زیاترە لە نوێژێکی کە بە تەنیا دەیکات.**

١٥٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَافَظَ عَلَى هَؤُلَاءِ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ»}(٤).

---

(١) أخرجه الترمذيُّ: ٢٤١، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه أحمد: ٢٣٣٩٥، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أخرجه مُسْلِم: ٦٥٠.

(٤) أخرجه ابْنُ خُزَيْمَةَ: ١١٤٢، وَقَالَ الألباني: إسنادهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَين.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پارێزگاری بکات لەسەر ئەو پێنج نوێژە فەڕزانەو نەیانچوێنێ لە بێ ئاگایان نانووسرێ.

١٥٩- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُوا الأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با ئەوانەتان کە خاوەنی عەقڵ و تێگەیشتنی زیاترن (واتە: قورئانی زیاتریان لەبەرەو تێگەیشتوترن) لە ڕیزی نوێژدا لە منەوە نیزیکتر بن، دوایی ئەوانەی دوای وان، دوایی ئەوانەی دوای وان (لە ڕووی قورئان و فیقهو تێگەیشتنەوە).

تێبینی: دیارە لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئەگەر پێشەواو ئیمام هەڵەیەکی کرد، کەم و کوڕیەکی هەبوو، شتێکی لە بیرچوو، ئەوەی کە شارەزابێ و لە تەنیشتیەوە بێ ئاسانتر دەتوانێ بۆی ڕاست بکاتەوەو هاوکاری بکات.

١٦٠- {عَنْ سَلْمَانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ فِي بَيْتِهِ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ، فَهُوَ زَائِرُ اللّهِ، وَحَقٌّ عَلَى الْمَزُورِ أَنْ يُكْرِمَ الزَّائِرَ»}[2].

واتە: سەلمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژێکی جوان بشوات لە ماڵێ، پاشان بڕوات بۆ مزگەوت، ئەوە دەبێتە میوان و سەردانکەری خوا، وە هەقە لەسەر خاوەن ماڵ و سەردانکراو، ڕێز لە میوان و سەردانکار بگرێ.

١٦١- {عَنْ عُثْمَان بْن عَفَّانَ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ بِفِنَاءِ أَحَدِكُمْ نَهَرٌ يَجْرِي يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مِرَارٍ، مَاذَا

---

(١) أخرجه مُسْلِم ٤٣٢.

(٢) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ في «الكبير»: ٦١٣٩، انظر: الصَّحِيحَة: ١١٦٩.

كَانَ مُبْقِيًا مِنْ دَرَنِهِ؟» قَالُوا: لَا شَيْءَ، قَالَ: «فَإِنَّ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ يُذْهِبْنَ بِالذُّنُوبِ كَمَا يُذْهِبُ الْمَاءُ الدَّرَنَ»}[١].

**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر ببینی لە نزیك ماڵی یەکێك لە ئێوە ڕووبارێك هەبێ، هەموو ڕۆژێ پێنج جار خۆی لێ بشوا، چ پیسییێك (بە جەستەیەوە) ماوە؟ گوتیان: هیچ شتێك، فەرمووی: بێگومان پێنج نوێژەکان گوناهەکان ناهێڵن و لایدەبەن، وەکو چۆن ئاو چڵك و پیسی لادەبات و نایهێڵێ.**

## دەربارەی: نوێژی بەیانی و عەصر

١٦٢- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ، فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ»}[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی نوێژی عەصری دەچێ وەك ئەوە وایە ماڵ و منداڵی خۆی هەموو لەناو بردبێ.**

١٦٣- {عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ صَلَّى البَرْدَيْنِ دَخَلَ الجَنَّةَ»}[٣].

**واتە: ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوێژی بەیانی و عەصر بکات (نەیان فەوتێنێت)، دەچێتە بەهەشت.**

١٦٤- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِنَّ أَفْضَلَ الصَّلَوَاتِ عِنْدَ اللّهِ صَلَاةُ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي جَمَاعَةٍ»}[٤].

---

(١) أخرجه أحمد: ٥١٨، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٥٢، ومسلم: ٦٢٦، والترمذي: ١٧٥، وابن ماجه: ٦٨٥.

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ٥٤٨.

(٤) أخرجه البَيْهَقي في «شعب الإيمان»: ٣٠٤٥، انظر صَحِيح الْجَامِع: ١١١٩ ، والصحيحة: ١٥٦٦.

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان باشترینی نوێژەکان لە لای خوا، ئەنجامدانی نوێژی بەیانییە بە کۆمەڵ لە ڕۆژی هەینی دا.

## دەربارەی: نوێژی خەوتنان و بەیانی

١٦٥- {عَنْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي صَلَاةِ الْعِشَاءِ، وَصَلَاةِ الْفَجْرِ، لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»}[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵك دەیانزانی چ پاداشتێك لە نوێژی (بە کۆمەڵی) خەوتنان و بەیانی دا هەیە بە گاگۆڵەش بووایە بۆی دەهاتن.

١٦٦- {عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ كَقِيَامِ لَيْلَةٍ»}[٢].

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس نوێژی خەوتنان و بەیانی بە کۆمەڵ بکات وەك ئەوە وایە لە هەموو شەوەکە نوێژی کردبێ.

١٦٧- {عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، قَالَ: دَخَلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ الْمَسْجِدَ بَعْدَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ، فَقَعَدَ وَحْدَهُ، فَقَعَدْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ، يَا ابْنَ أَخِي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ»}[٣].

---

(١) أخرجه البُخَارِيُّ: ٥٩٠، وابن ماجه: ٧٩٦.
(٢) أخرجه ابْنُ حِبَّانَ: ٢٠٥٥ .
(٣) أخرجه مُسْلِم: ٦٥٦ .

**واته: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو عەمرە دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دوای نوێژی مەغریب چووە نێو مزگەوت، بە تەنیا دانیشت، منیش لەلای دانیشتم، (عوسمان ﷺ) گوتی: ئەی کوڕی برام! گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس نوێژی عیشا بە کۆمەڵ بکات، وەك ئەوە وایە تا نیوەی شەو شەونوێژی کردبێ، وە هەر کەسێك نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکات وەك ئەوە وایە لە هەموو شەوەکە شەونوێژی کردبێ.**

١٦٨- {عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ الْمرْءِ فِي بيْتِهِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاتِهِ فِي مَسْجِدِي هَذَا إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ»}[١].

**واته: زەیدی کوڕی ثابیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی (سوننەت)ی پیاو لە ماڵی خۆی خێری زیاترەو باشترە لە نوێژ کردن لەو مزگەوتەی من (کە مزگەوتی مەدینەیە) جگە لە نوێژە فەرزەکان.**

## دەربارەی: دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی

١٦٩- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»}[٢].

**واته: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو ڕکات نوێژی (سوننەتی) بەیانی، چاکترە لە دونیاو ئەوەی لە دونیادا هەیە.**

١٧٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يُصَلِّ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ فَلْيُصَلِّهِمَا إِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ»}[٣].

---

(١) أخرجه أبو داود: ١٠٤٦، والترمذي: ٤٥٠، صححه الألباني.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٧٢٥ .

(٣) أخرجه ابْنُ حِبَّانَ: ٢٤٦٣، وَقَال شعيب الأرنؤوط: إسنادهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ البُخَارِي.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو ڕکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی نەکرد، کاتێك کە خۆر هەڵدێ با بیکات (با ئەو خێرە گەورەیەی لە دەست نەچێت).

## دەربارەی: هەڵسانەوەو شەونوێژ

١٧١- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْلِ فَإِنَّهُ دَأَبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُمْ، وَهُوَ قُرْبَةٌ إِلَى رَبِّكُمْ، وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ، وَمَنْهَاةٌ لِلإِثْمِ»}[١].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەو نوێژ بکەن و دەستی پێوەبگرن، چونکە شەو نوێژ لە کارو پیشەو عادەتی پیاوە صاڵحەکانی پێش ئێوە بووە، وە بە هۆی شەو نوێژەوە لە پەروەردگارتان نزیك دەبنەوە، وە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانتان و گێڕانەوەشتان لە خراپەکان.

١٧٢- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ الرَّجُلُ مِنَ اللَّيْلِ وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ فَصَلَّيَا رَكْعَتَيْنِ كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ»}[٢].

واتە: ئەبو سەعیدو ﷺ، ئەبو هورەیرە ﷺ هەردووکیان دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو هەڵسا لە شەودا خێزانەکەشی هەڵساندو پێکەوە دوو ڕکات نوێژیان کرد، ئەوە دەنووسرێن لەو پیاوو ژنانەی کە زۆر زیکرو یادی خوا دەکەن.

١٧٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ»}[٣].

---

(١) أخرجه الترمِذيُّ: ٣٥٤٩، وَقَال الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

(٢) أخرجه إبن ماجه: ١٣٣٥، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أخرجه مُسْلِم: ١١٦٣.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین نوێژ (کە خاوەنەکەی پاداشتی زۆری لەسەر بە دەست دێنێ) دوای نوێژە فەرزەکان، شەو نوێژە.

## دەربارەی: دانیشتن دوای نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵات

١٧٤- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى صَلَاةَ الْغَدَاةِ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ جَلَسَ يَذْكُرُ اللّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، انْقَلَبَ بِأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ»}[١].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوێژی بەیانی بکات بە کۆمەڵ، پاشان دابنیشێ و زیکرو یادی خوا بکات تاکو خۆر هەڵدێ، ئنجا هەڵسێ و دوو ڕکات نوێژی (سوننەت) بکات، ئەوە دەگەڕێتەوە (ماڵەوە) بە پاداشتی حەج و عومرەیەك.

## دەربارەی: سڵاو کردن

١٧٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِذَا لَقِيَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَإِنْ حَالَتْ بَيْنَهُمَا شَجَرَةٌ أَوْ جِدَارٌ، أَوْ حَجَرٌ، ثُمَّ لَقِيَهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ أَيْضًا»}[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە برای مسوڵمانی خۆی گەیشت با سڵاوی لێبکات، وە ئەگەر دارێك، یان دیوارێك، یان بەردێك کەوتە نێوانیان، پاشان پێی گەیشتەوە، با دیسان سڵاوی لێبکاتەوە.

---

(١) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ فِي «الكبير: ٧٧٤١، وَقَالَ الألباني: حَسَنٌ صَحِيح.

(٢) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٥٢٠٢، وَصَحَّحَهُ الألباني.

١٧٦- {عَنْ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَفَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ»}[١].

**واتە: زوبەیری کوڕی عەووام ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، ناچنە بەهەشت هەتا ئیمان نەهێنن، وە تا یەکدیشتان خۆشنەوێ ئیمانتان تەواو نابێ! جا ئایا کارێکتان پێ بڵێم ئەگەر ئەنجامی بدەن بە هۆیەوە یەکدیتان خۆشدەوێ؟ لە نێو خۆتان سڵاو بڵاو بکەنەوە.**

١٧٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَاءَ الرَّجُلُ الْمَجْلِسَ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِنْ جَلَسَ ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يَقُومَ قَبْلَ أَنْ يَتَفَرَّقَ الْمَجْلِسُ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِنَّ الْأُولَى لَيْسَتْ بِأَحَقَّ مِنَ الْأُخْرَى»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك هاتە مەجلیس با سڵاو بکات، جا ئەگەر دانیشت و دواتر پێویستیەکی هاتە پێش، ئیدی ویستی هەڵسێ، ئەوە پێش ئەوەی هەڵسێ و، جیابێتەوە لە مەجلیسەکە با سڵاو بکات، چونکە سڵاو کردنی سەرەتا لە پێشترو شایستەتر نیە لە سڵاو کردنی کۆتایی.**

١٧٩- {عَنْ فَضَالَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»}[٣].

**واتە: فەضالە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەسی سواری سڵاو لە کەسی دانیشتوو دەکات، وە پیادە سڵاو لەو کەسە دەکات کە دانیشتووە، وە ئەوانەی ژمارەیان کەمە سڵاو لەوانە دەکەن کە ژمارەیان زۆرە.**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٢٠٣.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ١٠٠٨، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ٥٨٧٨ ، مُسْلِم: ٢١٦٠، والترمذي: ٢٧٠٣.

## دەربارەی: سوێند خواردن

١٨٠- {عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى فَإِنْ شَاءَ مَضَى، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرَ حَنِثٍ»}[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سوێندی خواردو (إِنْ شَاءَاللّٰه)ی کرد، ئەگەر ویستی با سوێندەکەی بگەیەنێتەجێ، ئەگەر ویستیشی با سوێندەکە جێبەجێ نەکات، بەبێ ئەوەی کە سوێند شکاندنیشی بکەوێتە سەرێ (چونکە "إِنْ شَاءَاللّٰه"ی کردوە)، (واتە: با بڵێ: وەڵلاهی دەچمە فلان شوێن ئەگەر خوا بیەوێ بکات، دوایی نەشچێ کەفارەتی ناکەوێتە سەر).**

١٨١- {عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ أَدْرَكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ وَهْوَ يَسِيرُ فِي رَكْبٍ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ فَقَالَ: «أَلاَ إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ»}[٢].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتاب لە کاتێکدا دەڕۆیشت لە نێو کۆمەڵە سوارێکدا، سوێندی بە باوکی دەخوارد، بۆیە (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئاگاداربن خوا لێتان قەدەغە دەکات سوێند بە باوکتان بخۆن، هەر کەسێك سوێند دەخوا، با سوێند بە خوا بخوا، یان بێدەنگ بێ.**

١٨٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أَعْتَمَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ فَوَجَدَ الصِّبْيَةَ قَدْ نَامُوا، فَأَتَاهُ أَهْلُهُ بِطَعَامِهِ، فَحَلَفَ لاَ يَأْكُلُ مِنْ أَجْلِ صِبْيَتِهِ، ثُمَّ بَدَا لَهُ فَأَكَلَ، فَأَتَى رَسُولَ اللّهِ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ

---

(١) أخرجه النسائي: ٣٧٩٣، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه البُخَارِيُّ: ٦٦٤٦.

اللَّهِ ﷺ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ، فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَلْيَأْتِهَا، وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ نوێژی عیشای بە درەنگەوە ئەنجامدا، پاشان گەڕایەوە بۆ نێو ماڵ و منداڵی، بینی منداڵەکان خەوتوون، خێزانیشی هاتە لای و خواردنەکەی بۆ هێنا، جا سوێندی خوارد خواردنەکە نەخوات لەبەر خاتری منداڵەکانی، دواییش خواردنەکەی خوارد، بۆیە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو ئەوەی بۆ باسکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك سوێندی خوارد لەسەر شتێك، دوایی تەماشای کرد غەیری ئەوە باشترە، با ئەوەی کە بە چاکی دەزانی بیکات و، کەفارەتی سوێندەکەی بدات.**

١٨٣- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ، أَوْ فِيمَا لَا يَصْلُحُ، فَبِرُّهُ أَنْ لَا يُتِمَّ عَلَى ذَلِكَ»}[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سوێندی خوارد بە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، یاخود دەربارەی شتێك کە باش نەبێ، بۆ ئەو چاکتر ئەوەیە کە ئەو شتە جێبەجێ نەکات (بەڵکو سوێندەکەی بشکێنێت و کەفارەتی سوێندەکەی بدات).**

١٨٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، وَلَا بِأُمَّهَاتِكُمْ، وَلَا بِالْأَنْدَادِ، وَلَا تَحْلِفُوا إِلَّا بِاللَّهِ، وَلَا تَحْلِفُوا إِلَّا وَأَنْتُمْ صَادِقُونَ»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بە باوك و باپیرانتان مەخۆن، وە سوێند بە دایك و نەنکتان مەخۆن، وە**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٤٢٤١.

(٢) أخرجه ابْنُ مَاجَهْ: ٢١١٠، انظر: صَحِيح الْجَامِع: ٦٢١٥.

(٣) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٣٢٤٨، وَصَحَّحهُ الألباني.

سوێند بە بت و صەنەمەکان مەخۆن، وە جگە لە خوا بە هیچ شتی دیکە سوێند مەخۆن، وە سوێند بە خواش مەخۆن مەگەر ڕاستگۆبن.



تێبینی: واتە: بە درۆ سوێند بە خوا مەخۆن، هەتا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەگەر ئینسان بە درۆ سوێند بە خوا بخوا ئەهوەنترە لەوەی کە بە ڕاستی سوێند بە غەیری خوا بخوا، یانی: ئەگەر بە درۆ سوێند بە خوا بخوا، گوناهی کەمترە لەوەی کە بەڕاستی سوێند بە غەیری خوا بخوا.

١٨٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَاللَّهِ لَأَنْ يَلِجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ، آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ أَنْ يُعْطِي كَفَّارَتَهُ الَّتِي افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيْهِ»}[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بە خوا! ئەگەر یەکێك لە ئێوە کە سوێندی خواردوە لە ماڵی خۆیدا لەسەر سوێندەکەی بەردەوام بێ (واتە: کارێکی خراپ بێ، بۆ نموونە: سوێندی خواردوە دەبێ لە منداڵەکەی بدات، یاخود نەچێتە مزگەوت، یان سوێندی خواردوە سڵاو لە دراوسێکەی نەکات، سەردانی خوشك و برایەکی خۆی نەکات)، ئەوە بۆی گوناهبارکەرترە لە لای خوا، لەوەی (سوێندەکەی بشکێنێت و) کەفارەتەکەی بدات، کە خوا لەسەری فەرز کردوە.

## دەربارەی: مردن و مردووان

١٨٦- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيَنَامُ أَهْلُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: «النَّوْمُ أَخُو الْمَوْتِ، وَلَا يَمُوتُ أَهْلُ الْجَنَّةِ»}[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ: ئایا خەڵکی بەهەشت دەخەون؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: نووستن برای

---

(١) أخرجه البُخَارِي: ٦٢٥٠.

(٢) أخرجه الدَيْلَمِي: ٦٩٠٧، والبيهقي: ٤٤١٦، وَصَحَّحهُ الألباني.

**مردنە، خەڵکی بەهەشتیش نامرن (کەواتە: نوستنی تێدانیە، چونکە نوستن بۆ پشوودانی دوای ماندووییە، بەهەشتیش ماندووبوونی تێدانیە).**

١٨٧- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ»}(١).

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: هەموو بەندەیەك لەسەر ئەوە زیندوودەکرێتەوە کە لەسەری مردووە.**

١٨٨- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا»}(٢).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جنێو بە مردووان مەڵێن، لەبەر ئەوەی ڕۆیشتوون بەلای ئەو کردەوانەی پێش خۆیانیان خستووە (جا بە باش و خراپیانەوە).**

١٨٩- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا لَهَا، فَمَنْ تَبِعَهَا فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى تُوضَعَ»}(٣).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر جەنازەیەکتان بینی لەبەری هەڵسنەوە، وە هەر کەس بە دوای جەنازەکدا ڕۆیشت، با دانەنیشێ تا جەنازەکە دادەنرێ.**

١٩٠- {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَبْلَ مَوْتِهِ بِثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، يَقُولُ: «لَا يَمُوتَنَّ أَحَدُكُمْ إِلَّا وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»}(٤).

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٢٨٧٨ .
(٢) أخرجه مسلم: ٩٥٩.
(٣) أخرجه اَلْبُخَارِيّ: ١٣١٠ .
(٤) أخرجه مُسْلِم: ٢٦٧٥ .

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ پێش ئەوەی وەفات بکات، دەیفەرموو: با هیچ کەسێك لە ئێوە نەمرێ مەگەر ئەو کەسە گومانی باشی هەبێت بە خوا (واتە: هەموو کات ئومێدی ڕەحم و بەخشینی خواتان هەبێ).

١٩١- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مَيِّتٍ تُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ مِائَةً، كُلُّهُمْ يَشْفَعُونَ لَهُ، إِلَّا شُفِّعُوا فِيهِ»}[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر مردووێك کۆمەڵێك مسوڵمان نوێژی لەسەر بکەن ژمارەیان بگاتە سەد کەس هەموویان داوای لێی خۆشبوونی بۆ بکەن، (خوا) داواکانیان قبووڵ دەکات و لێی خۆش دەبێت.

١٩٢- {عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ، وَعَنِ الْأَوْعِيَةِ، وَأَنْ تُحْبَسَ لُحُومُ الْأَضَاحِيِّ بَعْدَ ثَلَاثٍ»، ثُمَّ قَالَ: «إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا فَإِنَّهَا تُذَكِّرُكُمِ الْآخِرَةَ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ الْأَوْعِيَةِ فَاشْرَبُوا فِيهَا، وَاجْتَنِبُوا كُلَّ مَا أَسْكَرَ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ أَنْ تَحْبِسُوهَا بَعْدَ ثَلَاثٍ، فَاحْبِسُوا مَا بَدَا لَكُمْ»}[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کرد لە سەردانی کردنی گۆڕەکان، وە نەهی کرد لە چەند جۆرە گۆزەیەك کە خۆشاوی تێدا دروست بکرێ (لە ترسی بوون بە ئارەق)، وە نەهی کرد لەوەی زیاد لە سێ ڕۆژ گۆشتی قوربانی هەڵبگیرێ، پاشان فەرمووی: پێشتر لێم قەدەغە کردبوون بچنە سەر گۆڕەکان، بەڵام ئێستا سەردانی بکەن، چونکە دوارۆژتان دەخاتەوە بیر، (یاخود مردنتان دەخاتەوە بیر)، وە قەدەغەم کردبوون لە چەند جۆرە گۆزەو دەفرێك بخۆن و بخۆنەوە تێیاندا، جا

---

(١) (أخرجه مُسْلِم: ٩٤٧.

(٢) أخرجه أحمد: ١٢٣٥ تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

**ئێستا بخۆنەوە تێیاندا، وە خۆتان دووربگرن لە هەموو سەرخۆشکەرێك، وە لێشم قەدەغە کردبوون زیاد لە سێ ڕۆژان گۆشتی قوربانی هەڵبگرن، ئێستا ئەوەندەی پێتان باشە هەڵیبگرن.**

١٩٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ» قِيلَ وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: «مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئامادە بێت لەسەر مردوویێك هەتا نوێژی لەسەر دەکرێ، ئەوە خێری قیراتێکی هەیە، وە ئەگەر ئامادە بێ تا دەنێژرێ، ئەوە خێری دوو قیراتی هەیە، گوترا: دوو قیراتەکان چین؟ فەرمووی: وەك دوو چیای گەورەن.**

١٩٤- {عَنْ كُرَيْبٍ، مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ مَاتَ ابْنٌ لَهُ بِقُدَيْدٍ - أَوْ بِعُسْفَانَ - فَقَالَ: يَا كُرَيْبُ، انْظُرْ مَا اجْتَمَعَ لَهُ مِنَ النَّاسِ، قَالَ: فَخَرَجْتُ، فَإِذَا نَاسٌ قَدِ اجْتَمَعُوا لَهُ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: تَقُولُ هُمْ أَرْبَعُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَخْرِجُوهُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلًا، لَا يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا، إِلَّا شَفَّعَهُمُ اللَّهُ فِيهِ»}[2].

**واتە: کوڕەیب خزمەتکاری ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە کە منداڵێکی وەفاتی کردوە، لە قودەید، یان عوسفان، جا گوتی: ئەی کوڕەیب تەماشا بکە، بزانە چەند خەڵك بۆی کۆبوونەتەوە (بۆ نوێژ لەسەر کردنی)؟ منیش چوومە دەرەوە، بینیم کۆمەڵە خەڵکێك بۆی کۆبوونەتەوە، جا هەواڵم پێدا، گوتی: پێت وایە چل کەس دەبن؟**

---

(١) (أخرجه البُخَارِي: ١٣٦١.

(٢)( أخرجه مُسْلِم: ٩٤٨.

(کوڕەیب) گوتی: بەڵێ، گوتی: بیهێننە دەرەوە (با نوێژی لەسەر بکەین)، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر مسوڵمانێك بمرێ چل کەس نوێژی لەسەر بکەن کە هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار نەدابێ ئەوە پەروەردگار لێی خۆش دەبێ، تکایان بۆی قبووڵ دەبێ.

١٩٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدْعُو: «اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَحْمَةً لِي مِنْ كُلِّ سُوءٍ»}[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای دەکرد (دەیفەرموو): خوایە دینداریەکەم چاك بکەی، کە پارێزەری ئیش و کارەکانمە، وە کاروباری دونیاشم بۆ چاك بکەی، کە ژیان و گوزەرانمی تێدایە، وە مردنیش بکەیە مایەی بەزەیی پێداهاتنەوەم لە هەموو خراپەیەك.

١٩٦- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ: مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، وَعِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، وَوَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ»}[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مرۆڤ مرد کردەوەکانی دەپچڕێ جگە لە سێ کردەوە نەبێ: چاکەیەکی بەردەوام، زانستێك سوود بگەیەنێ، یان منداڵێکی چاك دوعای بۆ بکات.

---

(١) أخرجه البُخَارِي في الأدب المفرد: ٦٦٨، ومسلم: ٧١.

(٢) أخرجه مسلم: ١٦٣١، والترمذي: ١٣٧٦، والنسائي: ٣٦٥١، وابن ماجه: ٢٤٢.

## دەربارەی: فیتنەو ئاشووب

١٩٧- {عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ زَمَانَ صَبْرٍ، لِلْمُتَمَسِّكِ فِيهِ أَجْرُ خَمْسِينَ شَهِيدًا»، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللّهِ، مِنَّا أَوْ مِنْهُمْ؟ قَالَ: «مِنْكُمْ»}[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە دوای ئێوە ڕۆژگاری ئارامگرتن هەن (لەسەر دینداری)، هەر کەسێك دەست بە دینەوە بگری و ئارامگربێ و (واز لە دینداری نەهێنێ) پاداشتی پەنجا شەهیدی هەیە، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (پەنجا شەهید) لە ئێمە یان لە خۆیان؟ فەرمووی: لە ئێوە!!**

١٩٨- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لَا يُقَالَ فِي الْأَرْضِ: اللّهُ، اللّهُ»}[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تێکچوونی دنیا نایێ هەتا ئەو کاتەی لەسەر زەوی ناگوترێ: (اللّهُ اللّهُ). (کەواتە: دونیا بەسەر خراپترین دروستکراوانی خوا کاول دەبێ، کە کەسیان تێدا نامێنێ بڵێ: (اللّه) کەس خوای لەبیر نامێنێ، ئەو کاتە مانای وایە کەس خێری پێوەنەماوەو ئەم ژیانەی دونیایە کە لەسەر ئەم زەویەیە بە یەکجاریی کۆتایی پێ دێت).**

١٩٩- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ العِلْمُ، وَيَثْبُتَ الْجَهْلُ، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا»}[٣].

---

(١) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ في «الكبير»: ١٣٩٤، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٣٧٣ .

(٣) أخرجه البخاري: ٦٤٢٣، ومسلم: ٢٦٧١، والترمذي: ٢٢٠٥.

**واته: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان له نیشانەکانی دونیا تێکچوون ئەوەیە: کە زانیاریی هەڵدەگیرێ و، نەزانی شوێنی دەگرێتەوەو خۆی دەچەسپێنێ و، شەڕاب دەخورێتەوەو، زیناو داوێنپیسی بە ئاشکرا ئەنجام دەدرێ.**

٢٠٠- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ»}[1].

**واته: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا تۆبەی بەندە قبووڵ دەکات بە مەرجێك ڕووحی نەگەیشتبێتە گەرووی (واتە: سەرەمەرگی نەگەیشتبیتێ).**

٢٠١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ، قَرِيبٌ مِنْ ثَلاَثِينَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ»}[2].

**واته: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا دەججال و درۆزن دەنێردرێن، نیزیکەی سی (کەس) دەبن، هەر هەموویان دەڵێن پێغەمبەرین!**

---

(١) أخرجه أحمد: ٦١٦٠، وَحَسَّنَهُ الألباني، قال شعيب الأرناؤوط : إسناده حسن.
(٢) أخرجه البُخَارِي: ٦٧٠٤ .

## قسەی نهێنی هێنان و بردن

٢٠٢- {عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ»}(١).

واتە: حوزەیفە ﷺ، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (هەرگیز لە سەرەتاوە) ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی قسە دێنێ و دەبات لە نێوان خەڵکدا (بۆ ئەوەی کێشەو ئاشووب بنێتەوە).

تێبینی: سیفەتی (قتات) لەبەر گەورەیی تاوانەکەی، خوای دادگەر ئەم سزایە سەختەی بۆ خاوەنەکەی داناوە، چونکە ئەم سیفەتە ئە واتایانە دەگرێتە خۆی:

١- ڕەنگە ئەو کەسە بچێ لە پشت دەرگا گوێ لەو قسانە بگرێت و بە خراپترین شێوە بیگێڕێتەوە.

٢- یان بە ئامرازێك، قسەکان تۆمار بکات و بیگوازێتەوەو بیگۆڕێ.

٣- یاخود نامەی مۆبایل، یان هەر ئامێرێکی دیکە دەدزێ و، بۆ مەبەستی ئاشووب بە کاری دێنێ.

بە داخەوە، ئەوانە ئێستا لە هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی زۆر زۆر بوون.

## نەفرین لە یەکدی کردن

٢٠٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ، قَالَ: «إِنِّي لَمْ أُبْعَثْ لَعَّانًا، وَلَكِنْ بُعِثْتُ رَحْمَةً»}(٢).

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٧٠٩، مسلم: ١٠٥.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٥٩٩.

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دوعاو نەفرین لە هاوبەش دانەران ناکەی؟! فەرمووی: من نەنێردراوم تاکو نەفرینکاربم، بەڵکو بە ڕەحمەت و بەزەیی بۆ خەڵك نێردراوم.**

## ستایش و پێداهەڵگوتنی کەسی بەرانبەر

٢٠٤- {عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَأَثْنَى عَلَيْهِ رَجُلٌ خَيْراً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ»، يَقُولُهُ مِرَاراً، «إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحاً لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: أَحْسَبُ كَذَا وَكَذَا "إِنْ كَانَ يَرَى أَنَّهُ كَذَلِكَ" وَحَسِيبُهُ اللَّهُ، وَلاَ يُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَداً»}[١].

**واتە: ئەبو بەکرە ﷺ، دەڵێ: پیاوێك لە لای پێغەمبەر ﷺ ناوی هێنرا جا پیاوێك (لەوێ بوو) زۆر ستایشی پیاوە ناوهێنراوەکەی کرد (ڕووبەڕوو)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هاوار بە حاڵت، ملی هاوەڵەکەت بڕی، چەند جارێك ئەمەی دووبار دەکردەوە، (فەرمووی:) ئەگەر یەکێك هیچ چارەی نەبوو هەر دەبووا مەدحی بەرانبەرەکەی بکات، ئەوە با بڵێ: من پێم وایە ئاواو ئاوایە، ئەوە لە حاڵەتێکدا ئەگەر بینی ئاوایە، وە بۆ لای خوا بیگێڕێتەوە (بڵێ: خوا زاناترە بە حەقیقەتەکەی)، با کەس تەزکیە نەکات بەسەر خواوە (چونکە هەر خوا بەندە ناسە).**

## دابڕین و قسە نەکردن لەگەڵ مسوڵمان

٢٠٥- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَاناً، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ»}[٢].

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٧١٤.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٧٢٦، ومسلم: ٢٥٥٩.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکدی مەبوغزێنن، وە ئێرەیی بە یەکدی مەبەن و، پشت لە یەکدی مەکەن، بەندەی خوابن و، پێکەوە برابن، وە حەڵاڵ نیە بۆ هیچ مسوڵمانێك لە سێ شەو زیاتر قسە لەگەڵ برای مسوڵمانی نەکات.

## بێ شەرم و ئابڕوویی

٢٠٦- {عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسَ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ: إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ»}[١].

واتە ئەبو مەسعوود ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ڕاستییدا یەکێك لەو شتانەی خەڵك پێی گەیشتووە لە قسەی پێغەمبەرەکان ئەمەیە: ئەگەر شەرمت نەکرد چیت دەوێ بیکە (واتە: کە مرۆڤ شەرمی نەما لە هیچ شتێکی ناڕەواو قێزەون سڵ ناکاتەوە).

## ڕەزیلی و چرووکی

٢٠٧- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاتَّقُوا الشُّحَّ، فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَحَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ، وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ»}[٢].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ستەم کردن، چونکە ستەم تاریکاییەکانی ڕۆژی دواییە، وە خۆتان بپارێزن لە ڕەزیلی و چرووکی، چونکە ڕەزیلی و چرووکی ئۆممەتەکانی پێش ئێوەی لە نێو بردو، وای لێکردن خوێنی یەکدیان ڕژاندو قەدەغەراوەکانی یەکدیان حەڵاڵ کرد.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٧٦٩.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٥٧٨.

۲۰۸- {عَنْ عَبْدِ اللّه بن عَمْرِو ﷺ: أَنَّ رَسُوْلَ اللّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُوا وَاشْرَبُوا وَتَصَدَّقُوا وَالْبسُوا، فِي غَيْرِ مَخِيْلَةٍ وَلاَ سَرَف، إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ أَنْ تُرَى نِعْمَتهُ علَىَ عَبْدِهِ»}[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بخۆن و بخۆنەوەو ببەخشن و بپۆشن، بێ ئەوەی کەشخەو فیزو زێدەڕۆیی تێدا بکەن، چونکە بێگومان خوا پێی خۆشە نیعمەتەکانی بەسەر بەندەکەیەوە ببینرێ.**

۲۰۹- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ»}[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەوڵەمەندی بە زۆری ماڵ و سامان نیە، بەڵکو دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی دڵە (واتە: قەناعەت هەبوون).**

۲۱۰- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «لاَ يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللّهِ، وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي جَوْفِ عَبْدٍ أَبَدَاً، وَلاَ يَجْتَمِعُ الشُّحُ وَالإِيمَانُ فِي قَلْبِ عَبْدٍ أَبَدَاً»}[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرگیز تۆزو خۆڵی تێکۆشان لە پێناوی خواو، دووکەڵی دۆزەخ پێکەوە لە ناخی بەندەدا کۆنابنەوە، هەروەها ڕەزیلی و ئیمان لە یەك کاتدا لە دڵی بەندەدا کۆنابنەوە.**

---

(۱) أخرجه أحْمَد: ٦٧٠٨، وَحَسَّنَهُ شعيب الأرنؤوط، وَقَالَ أحْمَدُ شاكر: إسنادهُ صَحِيحٌ.

(۲) أخرجه البخاري: ٦٠٨١، ومسلم:١٠٥١.

(۳) أخرجه النسائي: ٣١١٣، وابن ماجه: ٢٧٧٤، وابن حبان: ٣٢٥١، قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح لغيره.

## فەرمووده قودسیەکان

(الحَديثُ القُدْسِيّ): بریتیە لەو فەرموودانەی کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە خوای پەروەردگارەوە دەیگێڕێتەوە، جا هەر بێژەو لەفزەکە هی خوا بێ، یان تەنیا ماناکەی هی خوا بێت، بەڵام جگە لە قورئان، واتە: قورئان و فەرموودەی قودسی هەردووکیان هی خوای پەروەردگارن، لەگەڵ هەبوونی ئەو جیاوازیانەی خوارەوە:

## جیاوازی نێوان قورئان و فەرموودەی قودسی :

١- قورئان هەمووی لە ڕێی جبریل (علیه السلام)ەوە هاتوە، بەڵام فەرموودەی قودسی جاری وایە جبریل هێناویەتی، جاروا‌ش هەبووە خوا ئیلهامی دڵی پێغەمبەری کردوەو خستوویەتیە دڵی موبارەکی.

٢- قورئان موتەواوتیرە[١]، واتە: دڵنیایی و یەقینمان هەیە، هەمووی تەواوەو ڕاستە لە خواوەیە، بەڵام فەرموودەی قودسی هەیە ڕاستە، هەیە لاوازە، هەیە هەڵبەستراوە، کەواتە: هەموو فەرموودەیەکی قودسی صەحیح نیە.

٣- قورئان دابەش کراوە بۆ چەند سوورەت و ئایەت و حزب و بەشێك، بەڵام فەرموودەی قودسی وا نیە.

٤- قورئان لە ناو نوێژ دەخوێنرێ، بەڵام دروستە نیە فەرموودەی قودسی لە ناو نوێژ بخوێنرێ.

---

(١) المتواترُ: ما رَوَاهُ جماعة في كُل طبقة من طبقات السَّنَد تَحيلُ تواطؤهم وتوافقهم على الكذب واستندوا إلى أمرِ مَحسوس.

٥- پاداشتی خوێندنەوەی قورئان شتێکی جێگیرو سەلمێنراوە، بەڵام فەرموودەی قودسی هەمان فەزڵ و پلەو پاداشتی نیە.

٦- قورئان موعجیزەیەکی دەستەوسانکەرە بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین دەمێنێتەوە هەتا دونیا مابێ، بەڵام فەرموودەی قودسی موعجیزەو دەستەوسانکەر نیە.

٧- بڕوا نەبوون بە قورئان کوفرە، خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام و ئیمان دەچێتە دەر، بەڵام بڕوا نەبوون بە فەرموودەیەکی قودسی بە هۆی ئەوەی کە لاوازە نەك کوفر نیە، بەڵکو ئاساییە، (هەروەك زۆر فەرموودەی قودسی هەن کە لاوازن، لە ڕووی سەنەدەوە ناگەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ).

٨- دروست نیە قورئان بە مانا بگێڕدرێتەوە، بەڵام دروستە فەرموودەی قودسی بە مانا بگێڕدرێتەوە.

٢١١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَالَ اللَّهُ: «أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا فەرموویەتی: ئامادەم کردوە بۆ بەندە چاکەکانم (لە بەهەشت دا) نازو نیعمەتی وا نە هیچ چاوێك بینیویەتی و، نە هیچ گوێیەك بیستوویەتی و، نە بە خەیاڵ و دڵی هیچ کەسێکیش دا هاتوە، ئەگەر دەتانەوێ (زیاتر لەوە تێبگەن) ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة.

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٧٠٦٣ .

٢١٢- {عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ، وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ، وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ، وَالْمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ»}[١].

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوا (عَزَّ وَجَلَّ) فەرموویەتی: خۆشەویستی خۆم پێویست کردوە بۆ ئەو کەسانەی لەبەر من یەکدیان خۆشدەوێ، لەبەر من بەیەکەوە دادەنیشن، لەبەر من سەردانی یەکدی دەکەن، وە بە یەکدی دەبەخشن لە پێناوی ڕەزامەندی من.**

٢١٣- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ: إِذَا أَحَبَّ عَبْدِي لِقَائِي أَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ، وَإِذَا كَرِهَ لِقَائِي كَرِهْتُ لِقَاءَهُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا فەرموویەتی: هەر بەندەیەك پێی خۆش بێ بە من بگات، منیش پێم خۆشە پێی بگەم، وە ئەگەر ئەو پێی ناخۆشبێ بە من بگات، منیش پێم ناخۆشە بەو بگەم.**

٢١٤- {عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ رَبُّكُمْ: أَتَعْجَزُ يَا ابْنَ آدَمَ أَنْ تُصَلِّيَ أَوَّلَ النَّهَارِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ أَكْفِكَ بِهِنَّ آخِرَ يَوْمِكَ»}[٣].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئەی وەچەی ئادەم ئایا بێ توانای لە کردنی چوار ڕکات نوێژ لە سەرەتای ڕۆژ، کە بە هۆیەوە دەتپارێزم تا کۆتایی ئەو ڕۆژە.**

---

(١) أخرجه أحمد: ٥٧٥، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.
(٢) أخرجه البخاري: ٧٠٦٥ .
(٣) أخرجه أحمد: ١٧٨٢٨، وَصَحَّحَهُ الألباني.

٢١٥- {عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: الْمُتَحَابُّونَ فِي جَلَالِي لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمْ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ»}(١).

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوا (عَزَّ وَجَلَّ) فەرموویەتی: ئەوانەی لە بەر گەورەیی من یەکدیان خۆشدەوێ سەکۆو شوێنی نوورینیان هەیە (لە دواڕۆژ) کە پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن.**

٢١٦- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ قَالَ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ "يُرِيدُ عَيْنَيْهِ"»}(٢).

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: بێگومان خوا فەرموویەتی: ئەگەر دوو چاوم لە بەندەیەکی خۆم سەندەوەو کوێر بوو، ئەویش زۆر ئارامگر بوو، ئەوە من بۆی قەرەبوو دەکەمەوە بەوەی لە جیاتی دوو چاوەکانی بەهەشتی دەدەمێ.**

٢١٧- {عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا رَوَى عَنْ رَبِّهِ، «أَنَّهُ قَالَ: يَا عِبَادِي! إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ باللَّيلِ وَالنَّهارِ، وَأَنَا أغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً فَاسْتَغْفِرُونِي أغْفِرْ لَكُمْ»}(٣).

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەو فەرمایشتانەی لە پەروەردگاری دەیگێڕێتەوە، (فەرمووی): خوا فەرموویەتی: ئەی بەندەکانم! ئێوە هەڵەو گوناهان دەکەن بە ڕۆژو شەوان، وە من لە هەموو گوناهان خۆش دەبم و دەبوورم، بۆیە داوای لێخۆشبوونم لێ بکەن تا لێتان خۆشبم!!**

---

(١) أخرجه التِرمِذِيُّ: ٢٣٩٠، قال الألباني: صحيح.
(٢) أخرجه البُخَارِيُّ: ٥٣٢٩.
(٣) أخرجه مُسْلِم: ٦٧٣٧ .

٢١٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِسَيِّئَةٍ فَلَا تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا سَيِّئَةً، وَإِذَا هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا عَشْرًا»}(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا (عَزَّ وَجَلَّ) فەرموویەتی: هەر کات بەندەی من بە دڵی داهات خراپەیەك بکات لەسەری مەنووسن (لەبەر ئەوەی کە تەنها بەدڵی داهاتوە) جا ئەگەر کردی، خراپەیەکی بۆ بنووسن، وە هەرکاتێك چاکەیەکی بەدڵدا هات و ئەنجامی نەدا، چاکەیەکی بۆ بنووسن، وە ئەگەر ئەنجامیدا، دە چاکەی بۆ بنووسن.**

٢١٩- {عَنْ شُرَيْحٍ قَالَ سَمِعْتُ رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ قُمْ إِلَيَّ أَمْشِ إِلَيْكَ، وَامْشِ إِلَيَّ أُهَرْوِلْ إِلَيْكَ»}(٢).

**واتە: شورەیح دەڵێ: گوێم لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوو، دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرز فەرموویەتی: ئەی نەوەی ئادەم هەڵسە بۆ لام، من بە ڕۆیشتن دێم بۆ لات، وە تۆ بە ڕۆیشتن وەرە بۆ لام من بە ڕاکردن دێم بۆ لات.**

٢٢٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ فَقَالَ: إِنِّي أُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ، قَالَ: فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي السَّمَاءِ، فَيَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، قَالَ: ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الْأَرْضِ»}(٣).

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٣٣٠ .

(٢) أخرجه أحمد: ١٥٩٦٧، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٣) أخرجه أحمد: ٩٣٤١، ومسلم: ٢٦٣٧، وابن حبان: ٣٦٥.

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خوا بەندەیەکی خۆش بوێ بانگی جبریل دەکات و پێی دەفەرموێ: من فڵانە بەندەم خۆش دەوێ، تۆش خۆشت بوێ، جبریلیش خۆشی دەوێ، پاشان جبریل بانگ دەکات لە نێو ئەهلی ئاسمان (واتە: لە نێو فریشتەکان) دەڵێ: خوا فڵان بەندەی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ، جا ئەهلی ئاسمان هەموو خۆشیان دەوێ، پاشان لەسەر زەویش (ئەم خۆشەویستیەی) لێ قبووڵ دەکرێ (ئیماندارانیش خۆشیان دەوێ).

٢٢١- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَالَ: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: «مَنْ عَلِمَ أَنِّي ذُو قُدْرَةٍ عَلَى مَغْفِرَةِ الذُّنُوبِ، غَفَرْتُ لَهُ وَلاَ أُبَالِي مَا لَمْ يُشْرِك بِي شَيْئاً»}[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا (عَزَّ وَجَلَّ) فەرموویەتی: هەر کەسێك بزانێ و بڕوای وابێ (تەنها) من خاوەن توانای لێبوردنم لە گوناهان، ئەوە لێی خۆش دەبم و باکیشم نیە، مادام هیچ هاوبەشێکی بۆ پەیدا نەکردبم.

٢٢٢- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، فَمَنْ عَمِلَ لِي عَمَلًا أَشْرَكَ فِيهِ غَيْرِي، فَأَنَا مِنْهُ بَرِيءٌ، وَهُوَ لِلَّذِي أَشْرَكَ»}[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا (عَزَّ وَجَلَّ) فەرموویەتی: من دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندانم لە هاوبەشێتی دا (واتە: پێویستم بە هاوبەش نیە)، هەر کەسێك کردەوەیەك بکات بەشی غەیری منی تێبخات ئەوە من بەریم لەو، بەشەکەی خۆشم دەدەم بەوەی کراوە بە هاوبەشم (با چاوەڕێی پاداشت لە من نەکات).

---

(١) أخرجه الطَبَرَانِيُّ في «الكَبير»: ١١٦١٥، وَحَسَّنَهُ الألباني.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٢٩٨٥ .

٢٢٣- {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاء ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ! مَهْمَا عَبَدتَنِي وَرَجَوتَنِي وَلَمْ تُشْرِكْ بِي شَيْئاً، غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ فِيكَ، وَإِنْ استَقْبَلْتَنِي بِمِلءِ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ خَطَايَا وَذُنُوباً، اسْتَقْبَلْتُكَ بِمِلْئِهِنَّ مِنَ الْمَغْفِرَةِ وَأَغْفِرُ لَكَ وَلاَ أُبَالِي»}(١).

**واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرز فەرموویەتی: ئەی وەچەی ئادەم! هەرچەند تۆ بەندایەتی بکەی بۆم و تکام لێبکەی، وە هیچ هاوەڵێکم بۆ پەیدانەکەی، ئەوە منیش هەرچی تۆ کردبت (لە گوناح) لێت دەبوورم، وە ئەگەر پڕ بە ئاسمان و زەوی لە گوناهو تاوان بێیتەوە بۆ لام، منیش بە پڕی ئاسمان و زەوی لە لێبوردن پێشوازیت لێ دەکەم، وە لێت دەبوورم و هیچ باکم نیە.**

٢٢٤- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي، فإنْ ذَكَرَنِي فِي نَفسِهِ ذَكَرتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلأ ذَكَرتُهُ فِي مَلأ خَيْرٍ مِنْهُمْ»}(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرز فەرموویەتی: من بە پێی گومانی بەندەکەمم بە من، وە من لەگەڵ بەندەی خۆم دام کاتێك یادم دەکات و باسم دەکات، جا ئەگەر لە دڵی خۆیدا یادم بکات و باسم بکات منیش لە لای خۆم باسی دەکەم بە پەنهانی، بەڵام ئەگەر لە نێو کۆڕێك دا باسم بکات من لە کۆڕێکی باشتردا لە کۆڕەکەی ئەو باسی دەکەم (کە کۆڕی فریشتە نزیکەکانە).**

---

(١) أخرجه البَيْهَقِيُّ في «شعب الإيمان»: ١٠٤٠، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) أخرجه البُخاري: ٧٠٦٦ .

٢٢٥- {عَنْ جُنْدَبٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَدَّثَ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ وَاللَّهِ لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لِفُلاَنٍ، وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ: «مَنْ ذَا الَّذِي يَتَأَلَّى عَلَيَّ أَنْ لاَ أَغْفِرَ لِفُلاَنٍ؟! فَإِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِفُلاَنٍ، وَأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ»}(١).

**واتە: جوندب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پیاوێك سوێندی خواردو گوتی: وەڵڵاهی خوا لە فلانە کەس خۆش نابێت، جا خوای بەرزیش فەرمووی: ئەوە کێیە ئەو کەسە کە سوێند دەخوات لەسەر من، گوایە من لە فلانە کەس خۆشنابم؟! دە بە دڵنیایی ئەوە لێی خۆش بووم و کردەوە باشەکانی تۆشم هەڵوەشاندەوە.**

٢٢٦- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَلَمْ تَرَوْا إِلَى مَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالَ: «مَا أَنْعَمْتُ عَلَى عِبَادِي مِنْ نِعْمَةٍ إِلاَّ أَصْبَحَ فَرِيقٌ مِنْهُمْ بِهَا كَافِرِينَ، يَقُولُونَ الْكَوَاكِبُ وَبِالْكَوَاكِبِ»}(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا سەیر ناکەن بۆ ئەوەی پەروەردگارتان فەرموویەتی: هیچ نیعمەتێك نیە کە بیبەخشم بە بەندەکانم، حەتمەن گروپێك لەوان پێی کافر دەبن (بەوەی نیعمەتەکە لە خواوە نازانن لە شتێکی ترەوە دەزانن)، دەڵێن ئەستێرەکان بوون (ئەو نیعمەتەیان بەخشیوە)و بە فەزڵی ئەوان بووە.**

٢٢٧- {عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَقُولُ رَبُّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: «يَا ابْنَ آدَم تفَرَّغْ لعبادتي أملأ قلبَك غنًى، وأملأ يديك رزقًا، يَا ابْنَ آدَمَ لا تباعد مِنِّي فأمْلأ قَلبَك فقرًا، وأملأ يديك شُغْلاً»}(٣).

**واتە: مەعقیلی کوڕی یەسار ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارتان (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) دەفەرموێ: ئەی وەچەی**

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٦٢١.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٤١.

(٣) أخرجه الحاكم: ٧٩٢٦، وقال: صحيح الإسناد، وأخرجه أيضًا : أبو نعيم في الحلية (٢/٣٠٣) .

ئادەم خۆت یەکلایی بکەوە بۆ پەرستشی من، دڵت پڕ دەوڵەمەندی دەکەم و، دەستەکانت پڕ ڕزق و ڕۆزی دەکەم، ئەی وەچەی ئادەم لێم دوورمەکەوە جا ببێتە هۆی ئەوەی دڵت پڕ هەژاری بکەم و، دەستەکانت پڕ سەرقاڵیی و ماندوویێتی بکەم.

٢٢٨- {عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولُ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَيْسَ مِنْ عَمَلِ يَوْمٍ إِلَّا وَهُوَ يُخْتَمُ عَلَيْهِ، فَإِذَا مَرِضَ الْمُؤْمِنُ قَالَتْ الْمَلَائِكَةُ: يَا رَبَّنَا عَبْدُكَ فُلَانٌ قَدْ حَبَسْتَهُ، فَيَقُولُ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ: اخْتِمُوا لَهُ عَلَى مِثْلِ عَمَلِهِ حَتَّى يَبْرَأَ أَوْ يَمُوتَ»}[1].

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کردەوەی هیچ ڕۆژێك نیە حەتمەن سەرمۆر دەکرێت و دادەخرێت (زیادو کەمی تێناکەوێ)، جا ئەگەر بڕوادار نەخۆش بوو، فریشتەکان دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان فڵان بەندەی خۆتت بەند کردوە (پەرستشی وەك جاران پێ ناکرێ بەهۆی نەخۆشی)، پەروەردگاریش (عَزَّ وَجَلَّ) دەفەرموێ: (کردەوەکانی ڕۆژانی نەخۆشی) بۆ سەرمۆر بکەن و دایبخەن بە وێنەی کردەوەکانی (پێشی نەخۆشی) تا چاك دەبێتەوە، یان وەفات دەکات.

٢٢٩- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَسْأَلُ الْعَبْدَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَقُولَ: مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَ الْمُنْكَرَ أَنْ تُنْكِرَهُ؟ فَإِذَا لَقَّنَ اللَّهُ عَبْدًا حُجَّتَهُ قَالَ: يَا رَبِّ رَجَوْتُكَ وَفَرِقْتُ مِنَ النَّاسِ»}[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بە دڵنیایی خوا لێپێچینەوە لەگەڵ بەندەدا دەکات تاوەکو دەفەرموێ: چ شتێك وای لێکردی خراپە ببینی ڕێگری لێنەکەیت و بێ هەڵوێست بی (بە جۆرێك لە جۆرەکان)، جا ئەگەر خوای پەروەردگار

---

(١) أخرجه أحمد: ١٧٣٥٤، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

(٢) أخرجه أبي يعلى: ١٣٣٦، صححه الألباني.

حوججەو وەڵام بداتە بەندەکەی (بۆ ئەوەی وەڵامێکی چاك بداتەوەو خوای پەروەردگار ڕەحمی پێ بکات) بەندەکە دەڵێت: ئەی پەروەردگار ئومێدم بە ڕەحمی تۆ بوو و لە خەڵکیش ترسام (واتە لەبەر ترسی خەڵکی نەهیم لە خراپە پێ نەکرا، وە ئومێدیشم وابوو جەنابت لەو کارەم خۆش دەبی).

٢٣٠- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِنَّ أُمَّتَكَ لَا يَزَالُونَ يَقُولُونَ: مَا كَذَا؟ مَا كَذَا؟ حَتَّى يَقُولُوا: هَذَا اللَّهُ خَلَقَ الْخَلْقَ فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟»}(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: خوا (عَزَّ وَجَلَّ) فەرموویەتی: ئۆممەتەکەت بەردەوام (پرسیاری بێ سوود دەکەن و) دەڵێن: ئەوە چیە؟ ئەوە چیە؟ هەتا دەڵێن: ئەمە خوایە ئەم دروستکراوەی دروست کردوە، ئەدی کێ خوای دروست کردوە؟

تێبینی: هەر شتێك لەگەڵ عەقڵی سەلیم تێك نەکاتەوە کە عەقڵ دەرکی بکات لە ئیسلامدا حەڕامە، جا یەکێك لەو شتانەی حەڕامە و لەگەڵ عەقڵی سەلیم تێك ناکاتەوە، بریتیە لەوەی پرسیار بکرێت لەوەی کێ خوای دروست کردوە؟

جا لێرەدا ئێمە لە ڕوانگەی عەقڵەوە باس لەوە دەکەین بۆچی ئەو پرسیارە نامەعقولە: لەبەر ئەوە نامەعقولە چونکە دەبێ شتێك لە شتەکان سەرەتاو دروستکەری یەکەم بێت، نابێت هەر بڵێین: ئەدی کێ ئەوی دروست کردوە؟! جا هەندێك لەو مرۆڤانەی کە بڕوایان بە (اللّه) نەبووە و خۆیان پێ فەلسەفی بووە، بۆچوونی جیاوازیان هەبووە: هەندێك پێیان وابووە ئەسڵ و دروستکاری بونەوەر خۆڵ بووە، هەندێك دەڵێن: هەوا

---

(١) أخرجه البخاري: ٧٢٩٦، ومسلم ١٣٦ .

بووە، هەندێك دەڵێن: ئاگر بووە، هەندێك دەڵێن: ئاو بووە، گرنگ ئەوەیە هەموویان ماددەن و ئەوانیش شتێك هەر بە سەرەتا دەزانن، چونکە گشت عەقڵەکان کۆکن لەسەر ئەوەی دەبێ شتێك سەرەتای هەموو شتێك بێت و پرسیاری دیکە دروست نەبێ.

بەڵام لە ڕاستییدا گشت بۆچونەکان نامەعقول دەردەچن و کۆتایی بەو پرسیارە ناهێنن کە بگوترێ: (ئەدی کێ ئەوی دروست کردوە).

چۆن؟ بەوەی کە دەبێ مرۆڤی عاقڵ لە بوونەوەر تێبفکرێت و دەست لەسەر خالقی بوونەوەر دابنێت و بزانێ ئەو خوایە پێویستی بە چ سیفەتێك هەیە کە توانیویەتی ئەو بوونەوەرە بەو شێوەیە دروست بکات، بۆ وێنە: سەیر بکە چاوی مرۆڤ حەوت پەردەی تێدایە، هەموو دکتۆرەکان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەو حەوت پەردەیە دەبێ لە شوێنی خۆیان بن، ئەگەر شوێنی یەکێکیان بگۆڕدرێت بینین دروست نابێت، جا لێرەدا پرسیار دەکەین بۆچی ئەو چاوە ئاوا بەو شێوەیە دروست کراوە؟ بێگومان وەڵامەکەی ئەوەیە تا مەخلوقەکە پێی ببینێ و بینا بێ، کەواتە دروستکاری ئەو چاوە پێویستی بە چەندین سیفات هەیە، پێویستی بە ژیان هەیە، چونکە شتی مردوو چۆن شتی پێ دروست دەکرێ، وە پێویستی بە زانست هەیە، چونکە ئەو کارە ئاڵۆزو سەرسوڕهێنەرە چۆن بێ زانست دەکرێ، وە پێویستی بە بیستنە، چونکە ئەگەر بیستنی نەبێ چۆن بیستن بۆ بوونەوەر دروست دەکات، وە پێویستی بە ئیتقان و وردی هەیە، ئەگەرنا ناتوانێ ئەو وردیە دروست بکات، وە پێویستی بەوە هەیە ئاگای لە پێشهات و ڕابردوو و داهاتوو بێت، تا بوونەوەر بەڕێوە ببات...، جا تۆ زیاتر بیری لێ بکەو تێبڕامێنە!

ئنجا ئایا ئەو سیفەتانە لەو ماددە بێ ژیان و بێ زانست و بێ بیستن و بێ بینین و بێ ئاگایانە دێنەجێ؟! نەخێر بە دڵنیاییەوە، کەواتە هەر

پێویستە پرسیار بکەین و بڵێن: ئەو ماددانە خۆیان دروستکراون و سیفاتی خوایەتیان تێدانیە، کەواتە زۆر مەعقولە بڵێین: کێ ئەمانی دروست کردوە؟ چونکە مەعقول نیە ئەمانە خوا بن.

لە بەرانبەریشدا (اللّه) هەموو سیفەتی خوایەتی تێدایەو هەموو شتێك لە خواروی ئەوە لە سیفەتدا، کەواتە ئەو یەکەم و دروستکاری شتەکانەو هەر ئەو مەعقولە خوا بێت و، مەعقول نیە بگوترێت کێ (اللّه)ی دروست کردوەو، لەو پەڕی بەرزی بۆ نزمی بێیتە خوارو بیکەیتە خوا!!!

کەواتە ئیسلام دەیەوێ مرۆڤ تووشی نامەعقولی نەبێ، مەبەستی ئەوە نیە ڕێ لە عەقڵ بگرێ، بەڵام هەموو کەس نازانێ بە ڕێگای عەقڵدا بڕوات، بۆیە ئەو پرسیارانە حەڕامن و لە شەیتانەوەن، خوا هەموولامان پەنا بدات لە خوتخوتەکانی.

# نێوەڕۆك

٢٣٠

فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پارێزگاری لێکردن و کار پێکردنی لە کردەوە هەرە باش و گرنگەکانە، وە لە بەڕێزترین و گەورەترینی عیبادەتەکانە، جگە لە فەرزەکان، ئەو کەسەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەکات و لە ماناکەی تێدەگات و لە نێو خەڵك بڵاوی دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ غيره».

لەم فەرموودە دووعا کردن هەیە، یان هەواڵدان هەیە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی هەوڵی پاراستن و بڵاو کردنەوەی فەرموودە دەدات.

دیارە تێگەیشتن لە ئایین لە ڕێگەی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتەوە دەبێ، وە تێگەیشتن لە سوننەت لە ڕێی شرۆڤەو شیکردنەوەی زانایان دەبێ، هەر کەس ئەمەی کرد نیشانەی ئەوەیە خوا ویستی خێری بۆی هەیە.


کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە

■ 07504671394 - 07824671394
■ فەیس بووك : کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
■ هەولێر - بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

DESIGN
07504808081